# دیوانی دڵزار

# شیعر

چاپی دووەم: هەولێر ٢٠٠٦

پێداچوونەوەی: ئازاد دڵزار

## وەزارەتی رۆشنبیری

## بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

- کتێبی: دیوانی دڵزار - شیعر.
- ئامادەکردنی : دڵزار.
- زنجیرەی کتێب: (٢٤٠)
- چاپ: دووەم (٢٠٠٦)
- سەرپەرشتی چاپ: سعد شکاک
- پیت چنین : ئاری ئەحمەد - ئەژین عەبدوڵلا - هێمن سعد.
- هونەرکاری ناوەڕۆک: سۆزان محەمەد
- بەرگ: شێروان فاروق
- لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٧١٠ )ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ
- چاپ : بەڕێوەبەرایەتیی چاپخانەی رۆشنبیری/ هەولێر
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- بایی: ٥٠٠٠ دینارە

# پێشەکی

خوێنەری بەرێز ، چاپی یەکەمی ئەم دیوانەم لە ساڵی ١٩٩٢دا لە بەرگێکی قەشەنگ و بە ٣٩٤ لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی لە شاری ستۆکهۆڵم لە وڵاتی سوید بە چاپ گەیاندووە و ئەم بە شانەی خوارەوەی گرتۆتە خۆ :

١- ئاوازی ئاشتی و ئازادی .

٢-خەبات و ژیان .

٣-گوڵی تەمەن .

٤- تێکڕای ئەو شیعرانەی کە بۆم کۆکراوەتەوە.

٥- چەپکێک شیعری عەرەبی کە لە بۆنەی جیاجیادا گوتراون .

بەڵام لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بڕیارم دا بۆ جاری دووەم دیوانەکە چاپ بکەمەوە و وەزارەتی رۆشنبیری کوردستان ئەم ئەرکەی گرتە ئەستۆ و سوپاسی دەکەم:

١- تیراژی چاپی یەکەمی ستۆکهۆڵم تەنیا ٥٠٠ دانە بوو ، کە ژمارەیەکی زۆر کەمە و لەم کەمەش هەر سەد دانەیەک گەیشتە کوردستان و هەندێکیش لەکاتی هێنانەوەی بۆ کوردستان لە تورکیا دەستی بەسەردا گیرا .

٢- لەم چاپە نوێیەدا ئەم بەشانەشی خراوەتە سەر.

- هەندێ هەڵبەستی چاپ نەکراو.

- (گەنجینە) کە بەشێکە لەچوارنیەکانی بابا تاهیری هەمەدانی و سەدوهەشت چوارین لەخودەگرێ.

- ئەحمەدییەی ئەحمەد دڵزار هۆنراوەییێکی شەش سەدو شەیی رووسی کوردییە لەشێوەی فەرهەنگۆکێکدا.

- (کورتەیەک لە بێوگرافیای من)ی خراوەتە پاڵ کەزۆر لایەنی ژیانم روون دەکاتەوە.

٣- پێرستی هەڵبەست و پارچە شیعرەکان لە چاپی یەکەمدا ژمارەی لاپەڕەکانیان بۆ نەنووسراوە ، بۆیە بۆ دۆزینەوەی هەر هەڵبەست و پارچە شیعرێک ماندووبوونێکی زۆری دەوێ و لەم چاپەدا چارەسەر کراوە .

٤- لەم چاپە نوێیەدا هەموو ئەو هەڵبەست و پارچە شیعرانە بڵاو کراونەتەوە کە چنگم کەوتوون و مەرج نیە هەموویان لە ئاستێکی شیاوی هونەری دابن ، بەڵکو مەبەستمان لە چاپکردنیان پاراستنیان بووە لە فەوتان و لەناو چوونی ، هیوادارم خوێنەری بەرێز بە چاوێکی وردبینانە ئەم دیوانە بخوێنێتەوە و سەرنجی خۆی بەرامبەر دەربڕێ.

**دڵزار**
**هەولێر - گەڕەکی رووناکی**
**٢٠٠٦/٦/١٥**

# ئاوازی ئاشتی و ئازادی

پێشکەش بەو قارەمانانە بێت کەبەسەر هەموو جۆرە ئازارادانێکا زاڵبوون و کۆڵیان نەدا.

**دڵزار ئەیلولی ١٩٥٨**

## سەرەتا

**بەپێنوسی وردی**

دلزار ناوی ئەحمەدو کوڕی مستەفا ئاغایە، لەشاری (کۆیە - کۆیسنجەق)، هاتۆتە دنیا، هەرلەکاتی لاوی یەوە، هەستی شاعیری و خۆشەویستی ئەدەب، لە دلیا جێگیربووە. بۆ یەکەمجار، هەڵبەستێکی دانابوو، بۆی خوێندمەوە، لەساڵی ١٩٤٠داو پەسەندم کرد، پاش ئەوەی هەستێکی بەرزم لەکاک ئەحمەد دی.

دلزار لەشەڕی دووەمی دنیادا، عەسکەر بوو، ئینگلیزەکان وادەیان پیدابوو بیکەنە ئەفسەر، کەچی تەنیا دوو خەتیان دایە. بەو چەشنە بۆی دەرکەوت کە ئینگلیزەکان بۆ هەموو نەتەوەیەک فیشاڵ و درۆ نەبێ، چیدیکەیان نییە. لەغەریبی گەلێ شیعری داناوە، چۆتە فەلەستین و سوریەو لوبنان و قبرس، بەم وێنەیە دلزار چاوی کرایەوەو رۆژ بەرۆژ هەستی نیشتمانپەروەری لەدڵیا بەهێزتر دەبوو دلزار نەک تەنیا لەمەیدانی شیعردا ناوی دەرکردووە ، بەڵکە نیشتمانپەروەرێکی بەناویشە، لەناوچەی کۆیەدا.

حکومەتی پێشوو سێ ساڵ * حەپسی کردووە، نزیکەی چوارساڵیش، هەلاتوو بووە، برسێتی و رووتی و دەربەدەری زۆر دیوە، نزیکەی دەساڵ دەبێ.

هەمیشە خائینان پەلپیان پێ گرتووە، بەدرۆ و بەفیشاڵ لەبەندیخانە توندیان کردووە، بەلام کۆڵی نەداوە، هەمیشە بیروباوەڕی وابووە، کەمیللەت سەردەکەوێ.

دلزار کوردستانی زۆر خۆشدەوێ، ئەو کوردستانەی کەلەناویدا ژیاوە، گەلێ هەڵبەستی جوانی داناوە، کەهەمووی پیاهەڵگوتنی کوردستانی خۆشەویستە، بەم چەشنە باسی نەورۆز دەکا:

**مـــــژدە بەرن بۆ دلبــــەر نەورۆز وا گــــەڕایەوە**
**بای نەســـیـــمی شــادی هات، دەشـت و دەر رازایەوە**
**رازایەوە دەشت و دەر، بەگـوڵ و ســوسن و لیلوپەڕ**
**مـــــژدە بەرن بۆ دلبــــەر، نەورۆز وا گــــەڕایەوە**
**گــــەڕایەوە بەجـــوانی، چەندی بڵـــێی بتـــوانی**
**لەنایاتی یەزدانی، عـــــەقڵ حــــەیران مـــایەوە**

دلزار شەرمی بەئیشکردن نیە، کرێکاری، باخچەوانی، هەموو جۆرە ئیشێکی کردووەو بەشانازییەوە، بێڵەکەی لەسەر شانی ئەناو لەناو باخچەی تایبەتی خۆیان (ئۆمەر

خوچان)، ئیشی لەباغەکەیاندا دەکرد، بەپێکەنینەوە ئەیگوت: (باخچەوانم!). خائینان، هیچ ئیشێکیان نەئەدایەو هەمیشە برسییان ئەکرد، بەلاّم برسێتی لەتەسلیم بوون پیرۆزترە، هیوای سەرکەوتن هیچ کاتێ لەدڵیا دوورنەئەکەوتەوە، تا ئەو هیوایە، هیوای رووخانی دەوڵەتی کۆنەپەرستی عێراق هاتەدی، دلزارو هەموو ئازادی خواهەکان، لەراونان و بەندیخانە رزگاریان بوو، وا ئێستا لەشاری کۆیە ئەژیت و کتێبخانەی (جمهوریەت)ی کردۆتەوە.

دلزار دڵی زۆر تەڕە، گەرچی دەمێکە ژنی هێناوە، بەلاّم زۆر حەز لە دانانی هەڵبەستی دڵداری دەکات و لەم مەیدانەدا یەکجار پێشکەوتووە، سەدەها هەڵبەستی جوان جوانی داناوە، گەلێ لەهەڵبەستەکانی کراون بە گۆرانی میللی لەکۆیەو دەرەوەی کۆیەو گۆرانیبێژەکان ئەیانڵێن.

بەڵێ!، ئەم شاعیرە کوردە ئەگەر لەمیللەتێکی سەربەست و ئازادبوایە، من گومانم نەبوو، ئێستا میدالیای ئالتوونی بەسینگەوەبوو، بەلاّم داخەکەم ئێمە کە کوردین، دەتوانم بڵێم هەژارترین و بەدبەختترین میللەتی سەر رووی زەوین و هیچ جۆرە کیانێکمان نیە، هەتا لەبابەت ئەدەب و زانستەوەش، ماوەیەکی وامان پێ نەدراوە، کەهەنگاوێکی باش بنێین.

دلزار، بۆیە نرخی هەیە تەنیا شاعیر نییە، بەڵکە نیشتمانپەروەرێکی راستەو لە ریزی ئاشتیخوازانی کورد هەنگاوی ئازایانەی ناوە. وا بۆ یەکەمجار ئەم کۆمەڵە شیعرەمان بۆ چاپکرد.

ئیتر بژین شاعیرانی نیشتمانپەروەرو بروخێن ئەو چەند شاعیرو ئەدیبانەی کەملیان دابووە خیانەتکاری، دەهۆڵیان بۆ (شالیارو کالیارەکان لێ ئەدا!!) لەگۆڤارەکاندا.

## بۆ فریشتەی ئاسایش

بۆ تۆ سوپاس و ستایش
فریشتەی پاکی ئاسایش.

گوڵی چڵی هیوای گەلان،
ئاوازی بەرزی ژێ ی ژیان!

تووناکەری قارو قاتی،
داهێنەری خۆشی و هاتی.

لابەری هەوری مەینەتی،
دوابڕی دەردی برسێتی

شنەی شەماڵی دڵشادی،
مزگێنی هێنی ئازادی.

رووی میللەتانت تێ ئەکەم،
داوای یارمەتیت لێ ئەکەم.

ئامانجی بەرزم هەر ئەتۆی،
بۆ گەلان پشتیوان و هۆی.

بێ: بولبولی گوڵی ژینم،
فریشتەی پاک و نەخشینم.

بەرەو باخچەی گەلان بفڕین،
ئاوازی ئاسایش بچڕین.

بێ: گێتی پڕ مەترسی یە،
بێ: خەڵک رووت و برسی یە.

بازرگانانی مەرگ و شەڕ،
لەهەڵپەدان بۆ زیو و زەڕ.

وەک قەلی شووم قیرەدارن،
بۆ جەنگ بەهات و هاواران.

خەریک فێڵ و داو نانەوەن،
کە بێ نۆقرەو حەسانەوەن.

چەرمەسەری گەلان ئەدەن،
سەرو ماڵیان تالآن ئەکەن.

پرۆژەهای ئیمپریالی،
دائەنێن وەک هی مارشالی.

بۆ ئەوەی تا دنیا مابێ،
ژینیان چۆنە هەر ناوابێ.

هەروا درندەو خوێنمژبن،
تالآنکەرو، گەلان کوژبن.

بێ: ئەی دروشمی سەربەستی،
لەناوبەری دیلی و پەستی.

زەمین بێ وەستان با لێک دەین،
پرۆژەهای دوژمن تێک دەین.

بەیداخی ئاسایش هەڵکەین،
دێوی جەنگ هەڵگیرسێن پەلکەین.

ئاسایشخوازانی بەڕێز،
تاپشت نەستوور کەین و بەهێز!

دەبێ بەگێتی یا جاڕ دەین،
دەوری هێزی ئیستعمار دەین.

کۆمیتەی ئاسایشخوازان،
لەگشت لا ڕێکخەین بێ وچان.

تێکۆشین لەرێ ی بەربەستی،
شاڵاوی دێوی فاشستی.

ماوەی پەلاماری نەدەین،
ئاماجی پیسی دەربخەین.

با گەلان تێکرا هوشیارکەین،
لەراستیان ئاگادارکەین.

تێیان گەینین بۆ بمرین،
یەکتر بکوژین، بدڕین بپڕین؟

بۆ لەنیشتمانانی نەوت،
کەبۆتە کانگەی زۆرو زەوت،

خوێنی سوور و رەش تێکەڵ بن،
هەزاران هەزار پەل پەل بن؟

بۆ خــــاک و خــــۆڵـمــــان وێران بێ،
بەشـــــمـــــان لـەجێ ی ژیـان ژان بێ؟

بۆ بەهـۆی ئیـــمـــپـــریالیـــســـتـــان،
زەمین بـکرێ بـە گـــــۆڕســــتــــان؟

بـۆ لـەرێ ی ئـاســــــــایـش لادەیـن،
یەکــــتـــــر بەرەو مـــــردن رادەیـن؟

بـۆ بـە ئـەتـۆم و هـێـــــــــدرۆجـین،
ســـــەرانســـــەر خـــاپـوربێ زەمـین؟

بـــێ: بـــا بـــڕۆیـــن بـــۆ ئـــەوروپـــا،
بـۆ نـاوچـانـی تـیـپ و ســـــــوپـا.

بۆ نـاو کـــارخـــانـە جـــاتـەکـــان،
بۆ جـــەرگـــەی کـــان و کـــارگـــەکـــان.

بـــــۆ ولــــــکــــــەی دۆلار و دراو،
کـــانگەی رەنجـــخـــۆر و رەنجـــخـــوراو.

بۆ ئەمـــریکای ئیـــمـــپـــریالیـــســـت،
کـــــە بـۆژیـن بـۆتـە بـەرهـەڵـســت.

بۆ شـــاری (مـــارشـــاڵ) و (هـۆڤـــەر)،
بۆ پایتـــەخـــتی خـــەلـفـــەی هـتلـەر!

(دیـوی) و (ئەچیـــســـن) راکـــێش کـــەیـن،
نامـــەی گـــەلانیـــان پێـــشـکێش کـــەیـن.

چەرچل، بیڤن، ئەتلی، ئیدن،
شومان، رینۆ، بیدۆی خانین.

با ئاگادارکەین بێت و گەر،
ببنە هۆی داگیرسانی شەڕ.

ئەتۆم و دۆلار داد نادا،
ماڵیان ئەرمێ لە بنیادا.

قینی گەلان ئەبێتە گڕ،
هەڵیان ئەپرۆکێنێ لەپڕ

تەخت و بەختیان وەردەگێڕێ،
بۆ لای هتلەریان ئەنێرێ.

بەندیخانەی کووت
١٩٥٠/٦/٢٥

## یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەر

مژدەبێ ئەی چینەکانی رەنجبەرو دەستەی هەژار
ئەی ئەوانەی بەندو گیرۆدەن بەدەست سەرمایەدار
میللەتانی بێ سەوادو رووت و برسی و دەردەدار
ئەی کرێکارانی عالەم کۆمنستانی بەکار
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

* * *

تۆوی سۆسیالیست کەرۆژێ مارکس و ئەنگلسی ژیر
بۆ یەکەمجار چاندیان لەم رۆژەدا ڤیلادیمیر
جاری ئێکەم بوو کەوا بووم و بەری کرد دەستگیر
بۆیە دڵشادن دەسا وردو درشت گەنجان و پیر
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

* * *

حەوتی یانزەی حەڤدە بوو پێش نیوەڕۆ هاوڕێ لینین
لەشکری زەحمەتکێشانی برد بەرەو گوڵزاری ژین
قەیسەرو قەیسەریەتی رادایە چاڵی ژێرزەمین
مژدە بێ ئەی کارگەرانی بیروباوەڕ ئاسنین
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

* * *

شۆڕشی پیرۆزی ئۆکتۆبەر قەڵای زوڵمی رماند
کۆتی ژێردەستی و هەژاری شەشیەکی دنیای شکاند
رۆژی ئازادی ئیتر پەردەی شەوی دیلی دڕاند
مژدە بێ هاواری شۆڕش میللەتانی راپەڕاند
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

* * *

دەوڵەتی ماکینەپیسی قەیسەری جا پەک خرا
دەرکی زیندانی زەلیلی و دەردو مەینەت داخرا
لەو دەمەی بۆ خائینانی گەل، قەنارە هەڵخرا
مژدە بێ بەیداغی سووری سەربەخۆیی هەڵکرا
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

خاکی سۆڤیەت بوو بە بێشەی بێچوەشێرانی ژیان
بوو بە بێشکەی نەرم و نۆڵی بەختیاری بۆ گەلان
بوو بەقیبلەو ئابیدەی ئاواتی گشتی میللەتان
مژدە بێ وا مۆتەکەی شەرچوو بەرەو گۆری نەمان
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

بەندو بالۆرەی درۆ وەک دوکەڵێکی تارو رەش
تەفرو توونابوو بەدەرکەوت نووری راستی سوور وگەش
دادی دەردی خوێنمژانی هیچ نەدا تاکتیکی غەش
رۆژی رەشیانە کەوا نوقمن لەناو دەریایی هەش
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

رەورەوەی تاریخ و سەربەستی بەبێ سستی و سروەت
رۆژو شەو ئەڕوا و ئەهاڕێ کەندو کۆسپی چینی چەوت
هەروەکو دیمان کە قەیسەر چۆن بەبەر ئەم چەرخەکەوت
مژدە بێ پشتی شکا تیپ و سوپاکەی زۆرو زەوت
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

پاشی هاڕین و ئەمانی حوکمی پیسی قەیسەری
ویستی تاریخ راگری، دوژمن بەهێزی هتلەری
هەر ئەوەندەی زانی کوترا، چۆن کوتانێ، جەنجەری
هەر لە ئەمەریکا هەتاکو چین و ژاپۆن راپەڕی
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

هەر لەسەر رۆشنایی ئۆکتۆبەر بەهۆی هەوڵ و خەبات
رۆژهەڵاتی ئەوروپا دەرچوو لەکووکەو کارەسات
رۆژی ئازادی لەسەر هەڵهات و دیلی لێ هەڵات
کاتی دڵخۆشی گەلانە رۆژی پڕ ئاوات و هات
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

میللەتی چینیش لەسایەی پارتی کۆمۆنیستی بەرز
تیشکی ئازادی لەئاسمانی ئومێد هێنایە ئەرز
خوای شەڕو دۆلاری ئەمەریکانی هێنا ترس و لەرز
مژدە بێ چەسپا نیزامی حوکمی چینی تازە تەرز
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

خۆ گەلی کوریا و مەلایۆ هیندو هیندوستانی چین
هەر بەهۆی هاواری ئۆکتۆبەر بوو تێکرا راپەڕین
دوژمنی گەلیان بەزۆر هێنایەسەر رێگەی بەزین
مژدەبێ رۆچوو بەرەو رووخانە خانەی خوێنمژین
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

❊ ❊ ❊

رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش وا خەریکی خۆیەتی
واخەریکی تێک شکانی تەوقی سووڕ نەستۆیەتی
بۆ نەمانی حوکمی ئیمپریالی جوستو جۆیەتی
ئوردوگای دوژمن بەجاری شێوەن و رۆرۆیەتی
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی نۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە
* * *
خاک لەژێر پێی خوێنمژان بورکان و کێوی ئاگرە
یەکیەتی راستی گەلان شاڵاوی دوژمن راگرە
خەرمەنی ئاگر تیاچووی فاشی وشک و باگرە
لەشکری شادی سەرەپا دەشت و دنیا داگرە
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی نۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە
* * *
میللەتی تێکۆشەری بەرزی عێراقیش بێ وچان
هەوڵی داوەو هەوڵدا بۆ سەربەخۆیی نیشتمان
تیغی تێکۆشانی هەڵکیشاوە بۆ رووی دوژمنان
مژدە بێ نێزیکە دەرچێ رۆژی رووناکی ژیان
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی نۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە
* * *
میللەتی کانوون و گاورباغی داوای ژین ئەکا
لاپەڕەی تاریخ و ئازادی بەخوێن رەنگین ئەکا
حزبی فەهد و حازم و سارم ئەسر تەنمین ئەکا
وا سڵاوی گەرمی پێشکەش شۆڕشی تشرین ئەکا
جەژنی ئازادانە یادی شۆڕشی نۆکتۆبەرە
یادی رۆژی وەرگەڕانی تاج و تەختی قەیسەرە

بەندیخانەی کووت

١٩٤٩

## ئازادی

ئازادی تۆ گوڵاوی
گوڵی گەشی بەهەشتی

تۆ عەتری نێرگزجاڕو
سومبلزارانی دەشتی

پرشنگی رۆژو ورشەی
ئەستێرانی درشتی

ئاوازی بولبولانی
گەش و گۆڵی گوڵانی

سەربەرزی و کامەرانی
ئاسایش و هەرزانی

پرشنگی چاوی کاڵی
بریقەی کولمی ئاڵی

زەردەخەنەی منداڵی
شنەشنی شەماڵی

دەنگی کەمانی دووری
رەنگی شەفەقی سووری

بەراستی ئەی ئازادی
چرای شەقامی شادی

بێ تۆ بێ سوودە جوانی
بێ نەشەیە گۆرانی!

تاریکی یە رووناکی
تەیری عەنقایە چاکی

ناخۆشە دەنگی بولبول
گرانە بۆنی سومبول

جوانی گەرمێن و کوێستان
بێ ئازادبوونی ئینسان

وەک جوانی کۆشکی زۆردار
بێ بەهایە بۆ هەژار

هەولێر ۱۹۵۳

# ڕۆژی چین

فـریشـتـەی دڵگەشی یاران گـوڵی ئازادی ئەڕوێنێ
لەهـەوری بەخـتـیـاریدا گـەشی و شـادی ئەبارێنێ
گـوڵاڵەی شـادمـانی شـەوغی هێـمنایی دەپژێنێ
سـەرۆکی چینی بنچینەی نیـزامی نوو دەچەسـپێنێ
قەڵاو قوللەی هەژاری و برسێتی و رووتی لەبن دێنێ

※ ※ ※

بەزەبری خوێن کوفارەی سـەربەخۆیی شـادی پەخـشـان کرد
سـەراپا خاکەکەی چینی بەهەشت شێوەی دوڕ ئەفـشان کرد
(چیانکای شێکی) خوێنڕێژی شـیرزەو حـاڵ پەرێشان کرد
بەجـارێ شـەڕفـرۆش و خـائینانی خـانەوێران کـرد
دەرفـشی سـووری ئازادی چ بەجـوانی دەنەخـشـێنێ!

※ ※ ※

بەتێکۆشانی شـۆڕشگێری سـەیری میـللەتی چینی
بەخـوێنی سـووری لاوانی ئەبەردو مـەردی ئەیبینی
چلۆن ئازادی هێنادی لەسـەر شـێوازی لینینی
کەهەردەم تێ ئەکۆشێ بۆ چەقانی کۆڵەکەی ژینی
بەرەو پێش ڕەوڕەوەی مێژوو بەچاپووک دەستی ئەڕوێنێ!

※ ※ ※

لەژێر پێی دوژمنی قەومان زەمین یەکبارە بورکانە
قـەلای سـەرمـایەداری وا لـەهەرلا روو لەرووخـانە
لەبۆ هەرلا ئەچی ناوچەی خەبات و کۆڕی مـەیدانە
تەکانی تێکوپێکدانی کـەلەپچـەو کـۆت و زیندانە
بڵێسـەی ئاگری شـۆڕش لەهەرلا سـەر ئەبزوێنێ

※ ※ ※

ئیـتـر ئەی چین چراچی مـیللەتانی سـەرزەمینی تۆ
هێـلانەو کـۆشـی ئازادی و بنەی زانست و ژینی تۆ
لەکـۆنفـۆشـیـوسـی زاناوە بەجـێـمـاوەی نگینی تۆ
پەنای ئەو ڕەنگە شـاران و دەرو دەشـتی بەرینی تۆ
بەنەغـمـەی گـەورەیی تۆیە کـەدایک ڕۆڵە ئەنوێنێ

※ ※ ※

لـه دەوری یـانگسـتی و ئـاو و دەراو و لالـەزارانـت
لـەناو کـێـڵگەی برنج و دۆڵ و دەشـت و لێـرەوارانـت
لـەژێر سـایەی سـەهـەند و سـێبـەری سـەرو و چنارانت
لـەهـەڵپـەرکێ و سـەمـادایە درشـت و وردی یارانـت
وەکـو بـولبـول چـریکەی دێ نـەوای ئازادی ئەخـوێنێ

* * *

بنوو ئاسوودە گیان و دڵ، سـەرۆکی گەورە (سـون یات سـن)
بنوو ئەو سـەد هـەزارانەی هـەمـوو سـاڵێ ئەڕۆیشـتن
لـەبـەر بێ نـان و بێ بـەرگی ئـەچوونە باوەشـی مـردن
کـەسـوکاری ئـەوان ئـەمـڕۆ لـەکۆشـی خۆشـیا مـەسـتن
گـەلی هیـمـەت بڵندی تۆ ئـەویسـتـا مـردن ئەمـرێنێ!

* * *

لـەناو قـووڵایی زینـدانـا سـڵاوی گـەرمـی تێکۆشـین
ئەکەین پێشکەش بەحـزبی مـاو و سـەرپاکی گەلانی چین
بەڵێنیـان پێ دەدەین تاکـو لەسـەر ئەم خـاکـەدا مـابین
بەگـیـانی جـانفـدایانی ئەمـرمـان بۆ پەیامی ژین
دەکوشین تا شـەهێنی حـەق قـەلی ناحـەق ئەخنکێنێ!

بەندیخانەی کووت
نۆکتۆبەری ١٩٥٠

## لەبیرەوەری
## (١٦١)ساڵەی شۆڕشی فەرەنسەدا

ئەری شۆڕشی گەورەی ئازادی
وەرگێڕی تاج و تەختی بێ دادی
تێک و پێکدەری زیندانی باستیل
سەرفیرازکەری جوتیارانی دیل
تۆ شادی بەخش و مەینەت ڕەوێنی
قەلاڕمێن و گەردن پەڕێنی!
چرای سەربەستی و گڕی خەباتی
تیشک و پریشکی ڕۆژی نەجاتی
نرکەو نەعرەتەی قارەمانانت
جۆش و خرۆشی نەوجەوانانت
تێکرا هروژمی هەق خوراوانت
بانگی ئازادی کێژو لاوانت
گشت میللەتانی دنیای ڕاپەڕاند
کێوی دیلێتی و زۆری هەڵتەکاند
ئیتر ئەی گەلی فەرەنسەی گەورە
ئێمەیش لەعێراق لەم کات و دەورە
کەخاک و خۆڵمان گشتی باستیلە
وردو درشتمان بەجارێ دیلە
لەناو قوولایی بەندیخانەدا
لەگەڵ ئاوازی ئەم کۆتانەدا
ئەغمەی ئازادی و سڵاوی کۆشش
ئەکەین پێشکەشی میللەتی شۆڕش
فەرەنسەو عێراق لەشین و شایی
هەردوو یەک جۆرن بەبێ جیایی!
چۆن (گابریل بییری)و (فەهد)ی قارەمان

خـــــۆیان بـەخـــــتکرد لـەپێـنـاو ژیان
واش لـەپـاریـس و بـەغـــــدا بـەجــــارێ
دەســـتــەی زۆرداریان هێـنـایە خــوارێ *

* واتا شۆرشی فرەنسەو هێنانەخواری صالح جەبرو وەزیرەکانی لەکانوونی دووەمی ١٩٤٨دا

بەندیخانەی کووت
تەمموزی ١٩٥٠

## یادی دووەمی راپەرینەکەی ٢٧ی کانوونی دووەم ١٩٤٨

لـەم رۆژەیە گــەلی عــێــراق، کــەهێــرشی خــوێنین ئەکــا
وڵات ســـەرانســـەر دێتــە جــۆش، لەکـێـوی ئاگـرین ئەکــا
وەک شــێــر لـەبێـشــە دێتــە دەر، بەگـورجی راپەرین ئەکـا
چ راپـەریـن ئـەوەی کـــــەوا، دڵـی دوژمــن بـریـن ئـەکـــــا
ئەوەی پـەیمان و پـەرلـەمـــان، بەجـــارێ گــۆرنشـین ئەکـــا
جــەبر لەجــەبری جـــەبرەکـا، دەســتــەی تووشی بەزین ئەکـا
کــەهەوری پۆرتســمــوسی رەش، پەرتی بۆشــایی شین ئەکـا
گــوڵی ئومــێــدی خــوێنمــژان، دووچاری هەڵوەرین ئەکـا
بێگانەو خـــوارو خـــائینـان خـــەریکی زارو شـین ئەکـــا
چەند دێرێک لەدێریکەکــەی بەخــوێنی گــەش رەنگین ئەکـا

* * *

لـەکـــــاتێکدا وردو درشـت بـەگـــــەنج و دەسـت بـەدارەوە
بەکـۆمــەگی کـوردو عــەرەب بەخــەڵکی دەشـت و شــارەوە
بەئەشـــعــەری و بەجــەعــفــەری و بەرەنجــبــەر و هەژارەوە
بـەیارمــــــەتی کـــورو کچ و دایکانی خـــــوێندەوارەوە
بەپشــتــیــوانی کــارگــەری بەجــەرگ و جــەوهەردارەوە
بـەزەبـری بیـــــروباوەرو بـەچـەکـــــوش و بـەردو دارەوە
بەرابـەری گـــەنجی نـەبەز کـــەنەچـنە کـــۆری کـــارەوە

بێ ترس و لەرز لەو ئاگرەی وەک تەرزە دێتە خوارەوە
خوێنیان تێکەڵ دیجلە ئەکەن بەخەندەو ئیفتیخارەوە
لەرێ ی هێنانەدی گەلێکی حورو بەختیارەوە

*** 

ئیسپاتی گەلی ئەبەز، کەهەر ئەژیت و نامرێ
بەگرتووخانەو کوشتن و قەنارە قەت پەک ناخرێ
هەرچەندە بەندو بەستەبێ هەتاسەر کۆیلە ناکرێ
کەراپەڕێ قووەت نییە، تەوژم و تینی راگرێ
ئەئایسێ گەر دەماغ و دڵ، چرای سەربەستی ئاگرێ
ئەجۆشی گەر وردو درشت، پەیمانی دیلی ئادڕێ
بەراپەڕینی گەل ئەبێ، دەزگای دزی داناخرێ
تەنیا بەهۆی شۆڕش ئەبێ، دەردی ئەبوونی نابڕێ
بەهۆی لافاوی خوێن ئەبێ، خاشاکی ژین رانادرێ
بەخوێن دەبێ ئازادی وەربگیرێ چونکە نادرێ

*** 

نزیک بوو دەستی گەل بگاتە شاگوڵی چڵی ژیان
خەریک بوو داری سەربەخۆیی بێتەبەر لەنیشتمان
بچەسپی کۆڵەکەی ژیانی میللەتێکی کامەران
بەسەرچێ سات و سەردەمی تەمی خەمی زۆری و زیان
بچێ بەجارێ وەرگەڕێ تەخت و تەلاری خوێنمژان
بەڵێ نزیک بوو دەرکەوێ پڕشنگی رۆژی رەنجبەران
لادانی دەستەیەک ئەبا، بەرەو راستە رووەو ئەمان
کەپاڵی پێوەنان بەرەو زەلکاوی پیسی خائنان
فەرقی ئێستەو ئەوسامان دوور بوو وەک زەمین و ئاسمان
ئەگەرچی جەختە پاشەڕۆژی گەش بۆ گەلە بێگومان

## نەورۆز نامە

رۆژی نـــەو، رۆژی خـــــــــــــەبـات و راپـــەڕیـــن
رۆژی هـــاڕیــن و شــکـانــی کــــــــــــۆتـی ژیــن
لابـەری تـاری شـــــــــــەوانـی مـــــــــاتـەمـین
تێـکـدەری تـەخـت و تـەلاری خـــــــوێـنـمـــــــژیـن
هـەڵـکەنـی ریشــــەو رەگی. خـــوێـنـمـــژین و بەندەگی
یــادی تــۆ، یــادی پـەیـابـوونـت بـەخـــــــــــوێـن
یـادی تـۆ زنجـــــــــیـــــــــری زۆرداری شـکـێـن
یـادگـــــــــارێـکـە بـەڕاســــــــتـی خـــــەم رەوێـن
دڵ ئـەجـــــۆشـــــێـنێ وەکـــــو مــــــاک و هـەوێـن
هـان ئـەدا هـانـی گــــــەلان. بۆ قــــــڕانـی دوژمـنـان
لـەو دەمــــــــەی بـەفـــــری کــــــەژان ئـەتـوایـەوە
چـەشــــمـــــەســــاری ســــازگـــار ئـەژیـایـەوە
گـــــوڵ لـەگـــــوڵـزاران کـــــەوا ئـەکـــــرایـەوە
دیمـەنی زســـــتـــــانی شـــــەڕ ئەشـــــرایـەوە
رای ئـەکـرد سـەرمـا بەتاو. وەک سـوپای ئەفـراسـیـاو
خـــوێن و گـــوڵ تێکەڵ بەیەکـــتـــربوون کـــەوا
داری ئـــازادی لـــەنـــێـــــــــــــــــــــوانـــا ڕوا
رۆژی ئەو هـەڵـهـــــات لەبســــتـــۆی ئاســـــوا
تـەوقـی زۆرداری لـەگـــــــەردن و ئـەســـــــتـــــوا
تێـک شـکـێـنـرا تووڕدرا. باری مــــــەینەت لابـرا
لـەو دەمــــەی خـــەمـــــڵی بوو گـــوڵزار و چـەمــــەن
خـــێـــوەتی هـەڵدابوو ســــەرو و یـاســـــەمـــــەن
لـەو دەمـــــــەی ئـاهـورەمــــــەزدایی مـــــــەزن
خـــســــتــبــــوویە لەرزە تەخـــتی ئەهـریمەن
شـادی وەک لێـزمـەی بەهار. بێ وچان ئەرژایە خـوار
راپـەری مـــــــیـلـلـەت بـەجـــــــارێ راپـەڕی

قەفەقەفی زنجیری دیلی هەڵبڕی
جەرگی زۆرداری، بەجارێ هەڵدڕی
ژینی ئازادی بەخوێنی گەش کڕی
دای دڕی بەرگی ستەم ٠ دای بڕی تابووری غەم
ئێستە پاشی شۆڕشی گەورەی لینین
دوای رمانی هتلەر و نازی بەزین
پاشی دامەزرانی یاسای حوکمی چین
هەروەکو بورکانە سەرپاکی زەمین
بۆ نەمانی فاشیزم. مەرگی ئیمپریالیزم
تێ ئەکۆشین میللەتانی حەق خوراو
دێنە کۆڕی کارو کۆشش گەنج و لاو
رائەدەن خاشاکی ژین وێنەی شەتاو
بۆ وەدیهێنانی ئازادی تەواو
شۆڕش و جەولان ئەکەن. ماڵ و سەر قوربان ئەکەن!
یادی تۆ نەورۆزی ئازادی و ژیان
یادی هەڵسانی هەزاران رەنجبەران
کردەوەی کاوەی دلێرو قارەمان
بێگومان ئیسپات ئەکا بۆ میللەتان
شۆڕشی خوێنینە بەس. بۆ گەلان فەریادرەس
رێ ی شەرەف، رێگەی ژیان رۆشن ئەکا
کێوی نادانی و نەبوونی کون ئەکا
هێرشی سەرناگرو ناسن ئەکا
جەرگی ئیمپریالیزم ئەنجن ئەکا
رائەماڵی شوومی شەو. دائەهێنێ رۆژی نەو
رێ بەئیمپریالیزم نادەین ژیان
پڕ بکا چیتر لەئێش و ئەرک و ژان
هەڵبگیرسێنێ شەڕێکی بێ ئەمان
دەستی زۆرداری درێژکا بۆ گەلان

خوێن بڕێژێ وەک رووبار. لەش بنێژێ بێ ژمار!
هەوڵی ئاسایش ئەدەین و کارەکەین
میللەتی برسی لەخەو هوشیارەکەین
هێرشی سەر هێزی ئیستعمارەکەین
شەڕفرۆشانی دزێو ناچارەکەین
دەس لەئاسایش نەدەن. بۆ گەلان هێرش نەبەن

بەندیخانەی کوت
نەورۆزی ١٩٥١

# خەبات وژیان

چاپی یەکەم ١٩٦٠ بەغدا
پێشکەش
پێشکەشی ئەوکەسانە بێ
کەباشترین تێکۆشەرن
بۆ جەستەی میللەتی هەژار
دڵ و چاو و دەست و سەرن

# پێشەکی

عزالدين مصطفى رسول
ئەندامی یەکێتی ئەدیبانی عێراق

دڵزار شاعیری خەبات و ژیانە، هەر لەکۆڕی خەبات و ژیانیشا بەدڵزار گەیشتم و بوومە قوتابیەکی مامۆستا لەیاد نەکردووی.

وەک هەموو ئەوانەی کەدەست ئەدەنە خوێندنەوەی شیعرو ئەدەبی کوردی لە لاپەڕەکانی (گەلاوێژ)دا، هۆنراوەکانی دڵزارم ئەخوێندەوە، کەگیانی خۆشەویستی گەل و وڵاتی تیا جۆش ئەداین، یاخود جوانی سروشتی نیشتمانەکەمانی ئەخستە پێش چاومان و لەو ڕووەوە گیانی نیشتمانپەروەری پەرەپێ ئەداین. بەم جۆرە دڵزارم ناسی، یا لە لاپەڕە پیرۆزەکانی (ئازادی)دا، کەبە نهێنی شارو شارو دێ بەدێ، لەکوردستاندا بڵاوئەبووەوە، هەسۆزەوە (یادی جەژنی ئازادان)ی (شۆڕشی ئۆکتۆبەر) مان ئەخوێندەوە، کەگیانە ئومەمی بەکەی دڵزاری دەرئەخست و ئەو گیانە پیرۆزەی لای گەلی کوردی نەبەز ئەگەشاندەوە.

لەساڵی ١٩٥٣دا بوو لەکۆڕی خەباتدا دوور بەدوور بەنووسین لەگەڵ تێکۆشەرێکی شیوعیدا یەکترمان ناسی، بەراستی نامەکانی ئەو تێکۆشەرە کەلەناو حزبە قارەمانەکەماندا بوومە قوتابیەکی هاوخەباتی، گەلێک کاری کردە دەروونم و زۆر دەستی بوو لە پاڵپێوەنانما بۆ خۆشەویستی حزب و بەردەوامی هەمیشەیی لە ئیشکردندا لەحزبدا، هەروەها هەندێ لێکۆلینەوەو هات و بردەی نووسین لەگەڵ ئەو تێکۆشەرەدا تا رادەیەکی باش مێشکی وردبوونەوەو فێربوونی شۆڕشگێڕیی پژان، بەکورتی ئەو هاوڕێ یە گیانێکی کوڵنەدەری و باوەڕبەخۆکردنی دامێ و وای لێ کردم کەیادی هاوڕێ یەکی نەناسراوی حزب لەدڵما بژی.

هاوینی پار ١٩٥٩بوو، لەشاری هەولێر بەرەو شەقڵاوە ئەچووین بۆ کۆنگرەی مامۆستایانی کورد، لەوێ لەگەڵ دڵزارا بەیەکتری ناسێنراین، من وەک شاعیرێک لەدوورەوە ئەوم ئەناسی، بەڵام ئەو تێی گەیاندم کەمن لەنزیکترەوە ئەناسێ و هەندێ لەهات و بردەی ئەو نامانەی ساڵی ١٩٥٣ی بیرخستمەوەو زانیم هاوڕێ ی لەدڵا ژیاوەکەم دڵزاری شاعیری خەبات و ژیانە.

ئەمە سەرەتایەکی پێویست بوو لەباسی ئەم دیوانەی دڵزاردا کەخۆ بۆ خوێندەوار

دەرئەخات. کەدڵزار شاعیری خەبات و ژیانە. لەخەباتی تێکۆشەرانی کوردو عەرەبی عێراق، لەدوا وتەی قارەمانانی گەلی عێراق و شەهیدانی نەمری، لەهاواری هەمیشە لەگوێدا زرنگاوەی سەر سێدارەی فەهدی نەمر و هاوڕێکانی، لە لێزمەی تفەنگ و هاژەی دەست ڕێژو خوێنی خاک و ئاوەدەری بەندەکانی عێراق لە کانوون و تشریندا. لەمانەو لەتێکۆشانی هەموو گەلی جیهان و تام و بۆی خۆشی سەرکەوتنی ئەم گەل و ئەو گەلدا، لەمانە دڵزار چەپکە گوڵێکی هونراوی (خەبات) کۆئەکاتەوەو لەگوڵدانی ئەو بیروباوەڕەی لەخوێنی شەهیدان و لەئاواتی ناخی دەروونی و لەبازووی کۆڵنەدەریا هەمیشە بێ سردوتە، لەو بیروباوەڕەی مارکسی لینینی یەی وەک گوڵە ئەستێرە لەوچەپکە گوڵەدا ئەدرەوشێتەوە، دڵزار کۆمەڵە شیعرەکەی خەبات ئەباتە بەردەمی گەلی کوردی نەبەزو هەموو گەلی عێراق، بۆ ئەوەی ببێتە باشترین سروودی ڕێڕەوی کاروانی (ژیان)ی بەختیار دامەزرێنەری، وە دڵزار لەیادی ناچێ کەژیان لای ئەو گەلە خۆش بکات و رووی جوانی سروشتیان بۆ ڕەنگین بکات تا بە کوڵ بەرەو هەست بەخۆشی ئەو ژیان و سروشتە بڕۆن، یا بە دڵ ئەوخاکە پاکە پیرۆزە بپارێزین و ببنە قوربانی لەڕێگەیدا.

دڵزار کەشاعیری خەبات و ژیانە، زۆرباش لەوە گەیشتووە کەئەبێ خەبات بۆ کۆمەڵانی فراوانی گەل بێت و ژیانیش هەربۆ ئەوانە، بۆ زۆربەی گەل، بۆ زەحمەتکێشانە، لەبەر ئەوە ئەبینین هۆنراوەکانی ئەخاتە چوارچێوەیەکی ئەوتۆی (هەڵبەست)ەوە، کەبەشی زۆر لەو زەحمەتکێشانە تێی بگەن و بیکەنە گۆرانی و سرودی کاروانی خەباتی بەرەو ژیان ڕۆیشتویان، بێ ئەوەی لەنرخی هونەرمەندانەی شیعرەکانی کەم بکاتەوە.

بەجۆرێک کەئەتوانین بڵێین دڵزار یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی بەجوانی پەلی خوێندەوارانی - کەزۆربەی گەلی هێشتا سادەی ئێمەن - ئەگرێ و بەشەقامێکی ناوەڕاست لەنێوان بەرزی - تەنیای رادەی هونەرو تێگەیشتنی زۆربەی گەلا ئەیبات و شیعریان بۆ ئەڵێ. هەر ئەمە وامان لێ دەکا بڵێین شیعرەکانی دڵزار لەرووی ناوەڕۆک - مضمون -ەوە، بۆ گەل نووسراون و لەڕووی ڕووخسار - شکل -یشەوە لەو شیعرانەیە کەهونەرپەرستان زەوقی لێ وەرگرن، بۆیە ئەتوانم بڵێم دڵزار نموونەیەکی باشە بۆ شاعیری ئەم ڕۆژەمان و ئەبێ شاعیرەکانمان بەو ڕێگەیەی دڵزاردا پەلی خوێندەواران بگرن رووەو بەرزکردنەوەی رادەی لەهونەر گەیشتنیان تا بەتەواوی بەرهەمیان بۆ گەل بێت، بەشێک بێت لەخەباتی گەل و بەردێک بێت لەو تەلارەی ژیانی بەختیاری گەلدا کەبەرزئەبێتەوەو هەر بەمە خۆشیان ئەبن بەشاعیری گەل، شاعیری خەبات و ژیان.

# قینی گەل

قارو قینی گەل بەجاریٚ دای لەهاڕژن و تەقین
چەشنی بورکانیٚ لە شێوەی شۆڕشێکی ئاگرین
ئاگریکی بیٚ ئەمانی خستە خانەی خوێنمژان
ژینی لیٚ کردن بەدۆزەخ سووری لیٚ کردن بەشین
تێکی دا یاساو رژێمی بیٚ فەڕی پاشایەتی
تەفرو تووناى کرد بت و هەم بت پەرستانی لەعین
فەیسەل و عەبدولئیلا و نووری نەیاری نیشتمان
دوژمنانی گەل بە دەستی گەل لەناوچوون و رزین!

* * *

ئیتحادی هاشمی هەروەک تەمیٚ بوو رەویەوە
هەر کە تیشکی رۆژی شۆڕش رۆشنی خستە زەمین
باڵەخانەی بیٚ بناغەی حیلفی بەغدا جیٚ بەجیٚ
ژێر بەرەو ژوور بوو، بەیەک لێدان و یەک تیشەو کوین
شاو و شەمعون و حوسەین و مەندەریس پشتیان شکا
لەندەن و پاریس و واشنتۆن وشک بوون و تەزین
با بزانن دوژمنانی گەل، بزانن رەنجمژان
رابەری رێگەی خەباتی میللەتین و نابەزین
گرتن و لێدان و زنجیرکردن و کوشتن چییە
ئێمە خاوەن بیرو عەزم و باوەڕێکین ئاسنین
بەندیخانەی نوگرەو باقووبەو بەغداو کووت
باش نەزانن ئێمە کێین و چاک نەزانن ئێمە چین
نابەزین هەروەک نەبەز بووین گەر سەریشمان دابنێین
ئێمە پێشمەرگەی خەباتی سوورو رۆڵەی شۆڕشین

* * *

ناگـــــرو ئاسـن ئەبەد رێگا لـەمــــــیلـلـەت ناگـــــرن
هەر ئەبێ بڕواو بگاتە خـــۆشــــتـــرین قـــۆناغی ژین
ناوی ئامـــــێنێ لـەمـــــــەولا بێ بەشی و رووتی و نەبوون
کـەپرو کـــۆڵـیـــتی هەژاران ئەبنە کـۆشک و شـــانشـین!
ئیش و کـــارو ژینی ســـەربەســتی لە بۆ هەمـــوان ئەبێ
بێ جــــیــــاوازی لـەبەینی قــــەوم و هـۆز، ئایین و دین
کـــۆتری ئاشــتی شـــاپەری باڵی ســپی و پیـــرۆزی خـــۆی
رانەکـــیــــشێ بۆ هەمـــوولا، دێتـــــە پەرواز و فــــڕین
ئەو دەمـــە ، ئەو رۆژە کـــوردیش، کـــوردی ســـەرپاکی وڵات
دەس لـەمل هیـوا ئەکـەین رزگـارەبین ســـەربەســت ئەژین

کۆیە: ١٩٥٨/٧/١٩

## سەربەستی

لـەناو باغی ژیان هەردەم گـولێکی ســـووره ســـەربەســـتی
لەناوگشت کۆمـەڵی عـالەم بڵـیسـەی نووره ســەربەسـتی
لەئاســمـانی ســەعـادەت دا، لەشـەوق و رەنگ و پڕشـنگدا
گــەلاوێژی پڕ ئاوازی شـــەوی دەیجــووره ســـەربەســـتی
کۆیە: ١٩٤٢

## شاگردانی فەهدین

کەشاگردانی فەهدی قارەمانین
لەتێکۆشانی خوێنین بێ وچانین
لەبۆ لەتکردنی جەرگی ستەمکار
بەوێنەی خەنجەری تیژی دەبانین
بەرامبەر دوژمنی خوێنرێژی زۆردار
لەمەیدانی شەڕا شێری ژیانین
لەفاشیزم نەمان و مانی میللەت
هەموو باوەڕ بەهێز و بێ گومانین
لەکاتی شۆڕش و ڕۆژانی هەڵمەت
سوپای سووری بەکاری نیشتمانین
قەڵاچۆی لەشکری داگیرکەرانین
قڕانی شێخ میروو خوێنمژانین
لەڕاست میللەت فرۆشانا هەموو دەم
هەوێن و ماکی نەرک و ژارو ژانین
نیتر بۆ تەفرو توونابوونی دوژمن
چەکی نەتۆمی تازەی بێ نەمانین
لەرێ ی نازادیا دانێین سەریشمان
بەسەربەستی نەچین و کامەرانین
نەیاری گشتی نەیارانی وڵاتین
برای چینی کرێکارو سەپانین
لەمەرحەق رێ گرانی گیانی میللەت
لەدڵ سەختی وەکو بەردی حەلانین!
لەناقار میللەتی بیمارو برسی
وەکو باوانی مەندو مهرەبانین!
پزیشکی دەردی پڕ نەرکی هەژارین
لەدەرمان و لەچارەی چاک نەزانین

لەپیش قاپی قەلاکەی سەختی گەلدا
بەهوشیاری هەمیشە پاسەوانین
جگەر سۆزین لەبابەت ڕێک و پێکی
کەوا تێ هەڵدەری گشت تێکدەرانین
بەسەرچوو دەوری سەرشۆڕانی ڕووڕەش
بەدووری خۆپەرست و خائینانین
لەگەڵ کاروانی مێژوودا لەرێگاین
چ دەربەستی حەپەو لوورەی سەگانین
ئەڕۆین بۆ باغی ئازادی و گوشادی
کەلەو باغەبەیانی باغەوانین
گوڵی سەربەستی ئەڕوێنین بەچوستی
لەبۆ ئاوی ژیان و مانی کانین
دەبێ ئیسپاتی کەین بۆ دۆست و دوژمن
کەشاگردانی فەهدی قارەمانین

بەندیخانەی کووت

١٩٥٠

## داری ئازادی (*)

ئەگەر لەگەڵ یەک ڕاست و دڵپاک بین
بۆ یەکتر باب و برازاو کاک بین
بۆسەر قەڵاتی خوێنمژ تاو ئەدەین
بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

*

چاومان لەژینی کامەرانی بێ
هیواو ئامانجمان گەر ئینسانی بێ
خوێنی هەزاران گەنج و لاو ئەدەین
بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

*

بەربەرەکانی هێزی شەڕ ئەکەین
بەسەرکەوتنی هەق باوەڕ ئەکەین
بڕیاری ڕاست و زۆر تەواو ئەدەین
بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

*

لەژێرو ژووری وڵات جاڕ ئەدەین
پەلاماری سەر ئیستعمار ئەدەین
یارمەتی گەلی هەق خوراو ئەدەین
بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

*

هەردەم هەوڵە دەین بەبێ ترس و لەرز
لەبۆ گەیشتن بەئاواتی بەرز
خۆمان لەهەزار بەندو باو ئەدەین

بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

*

ئیمپریالیزمی وەحشی راو ئەکەین
لەگشت لایەکی تەنگەتاو ئەکەین
گوللەی لەکەللمو جەرگ و ناو ئەدەین
بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

*

بێ شک سەرکەوتن بۆ سەربەستی یە
هەروەکو مردن بۆ فاشستی یە
بۆ کفنی خوێنمژ دەزوو جاو ئەدەین!
بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەین
داری ئازادی بەخوێن ئاو ئەدەین

* بووە بەیەکێک لەگۆرانی یەکانی تایەر تۆفیق

کۆیە ١٩٤٦

## دنیا

دنیا باغێکە ژیان گولیەتی
ئازادی زادی گەلاو چلیەتی
هیوا ئاوازی خۆش بولبولیەتی
دیلی میکرۆب و کرمی گلیەتی!

کۆیە: ١٩٤٦

# کۆشکی رایخشتاخ

کۆشکی رایخشتاخ، هێلانەی نازی
کاتێ بە زوڵم و زۆرت نەنازی
دڵی گەلانت هێنابووە لەرزە
شادیت بڕی بوو لەڕووی ئەم ئەرزە
سەنگەری سەختی سەنگەساری بووی
قەڵای قایمی ستەمکاری بووی
کۆی هیمالایای سەر رێ ی شادی بووی
دەریای باسفیکی پێش ئازادی بووی
جێ ی بڕیاردانی فەرمانی جەنگ بووی
جێگای گۆبلزو هێس و گورنگ بووی
راووتەدبیری هتلەری گومڕا
لەناو چوارچێوەی تۆبوو دائەنرا
بەڵام لەکام کات؟ لەوکاتەی کەوا
قافڵەی ئازادی لەرۆژو شەوا
سەرەوتی نەبوو، ئەچوو بەرەو پێش
گوێ ی نەئەدایە دەردو زام و ئێش
پێنج ساڵ و هەشت مانگ هێزی خێرو شەڕ
لەئاسمانی بەرز لەبەحرو لەبەڕ
بەگژیەکاچوون، هەتا لەئەنجام
تەفرو توونا بوو فاشستی نیزام
ئێستا رایخشتاخ بارت گۆڕاوە
ئاڵای ئازادیت لەسەر چەقاوە
ئەو ئاڵا سوورەی کەتۆ ئەیبینی
ئەلاریتەوەو با ئەی هەژێنی
بەملیۆنها ئیشکەر و جووتیار
یەک دەنگ و یەک رەنگ گشتیان فیداکار
بەگیان و لەش و دڵ ئەی پارێزن
چونکە ئیمان و باوەڕ بەهێزن
هێزی ئازادی کەژ دەهەژێنێ
رەگی ئیستعمار لەبن دەردێنێ

کۆیە: ١٩٤٦

## گۆرانی کارگەران

کارگەرین جەنگاوەرین   /   رەنجبەرین، تێکۆشەرین
بۆ قەڵای سەرمایەدار   /   تێکدەرین ، تێکدەرین
ئێمە رۆڵەی شۆڕشین   /   قارەمانی هێرشین
بۆ سوپای خونخواری خوار   /   قڕکەرین، دوابڕین
نیشکەرین داهێنەرین   /   ئێمە گەنج و گەوهەرین
بۆ هەموو کردارو کار   /   پێشڕەوین، پێشڕەوین
نامرین قەت نامرین   /   هەر ئەژین و هەر ئەژین
بۆ گەلی برسی و هەژار   /   رێکخەرین، رابەرین
دوژمنان بەرباد ئەکەین   /   نیشتمان ئازاد ئەکەین
بۆ گەلێکی بەختیار   /   هەوڵدەین هەوڵدەین

بەندیخانەی کووت
١٩٥٠

## سوپای سوور

کاتی دڵخۆشی گەلانە رۆژی کەیف و شادی یە
یادی دامەزرانی بنچینەی قەڵای ئازادی یە
رۆژی ئاوابوونی رۆژی بەندەگی و بێ دادی یە
لەشکری دوژمن بەجاری رووبەرووی بەربادی یە
جەژنی پیرۆزی پەیابوونی سوپاکەی سوورەسا
یادی قڕبوونی قشوونی قەیسەرانی روسیا

*

رۆژی جەژنی لەشکرێکە تێکدەری فاشیستییە
شوورەیەکی سەخت و پۆڵابەندی سۆسیالیستییە
پشتیوانی چوون یەکی و ئازادی و سەربەستییە
لابەری باری گرانی کۆیلەیی و ژێردەستییە
رۆژی چەسپان و چەقانی کۆڵەکەی ئاسایشە
وەک بەهەشتی کامەرانی دەشت و دەر ئارایشە

*

لەشکری سوور، لەشکری ئاسایش و هەرزانییە
لابەری دەردی زەبوونی و زیللەت و بێ نانییە
بۆ قەڵای سەرمایەداری (دوودەوی) وێرانییە
پاسەوانی میهرەبانی کۆمەڵی ئینسانییە
ئاگرێکی بێ ئەمانە بۆ خەڵەی خونخواری خوار
مەردنێکی بێ گومانە بۆ سوپای سەرمایەدار

❋

هێزی سووری سۆڤیێتی واتا هەموو دانیشتوان
یانی گشتی تێگەیشتوو پێگەیشتوو ئیشکەران
دایک و باوان و کچ و لاوانی شادو کامەران
ئەو کەسانەی هاودەمی خۆشین لەگوڵزاری ژیان
یانی هاوڕێیانی هەڵمەت بەر بەوێنەی شێرو وێز
یانی فورشیلوف و ژۆکۆفی بڵندپایەو بەڕێز

❋

لەشکری تێکۆشەری کۆریای دلێرو کۆڵنەدەر
وێنەیەکی زۆر بچووکە بۆ سوپای سووری بەفەڕ
سەیری چۆن دوژمن بەرەو دەریا ئەبا وەک رانەمەڕ
تانک و تۆپ و گوللەو بۆمبا گڕێ ی ناخاتەبەر
بەفرو خوێن و ئاگرو ئاسن ئەبەد رێ ی ناگرێ
میللەتێکی زیندووە بیبڕای ببڕ دیل ناکرێ!

❋

جەژنی هێزێکە سوپای سووری بەکاری پێ دەڵێن
هەڵگری بەیداغی سووری بەختیاری پێ دەڵێن
لابەری ئازارو دەردی سەنگەساری پێ دەڵێن
تێکدەری تیپ و سوپای سەرمایەداری پێ دەڵین
دیدەنی ئاسایش و ئازادیی و رزگارییە
کردەوەی دەرکردنی ریشەو رەگی زۆرداری یە

❋

هێزی سوور زادەی نیزامی جۆرە ژینێکە بەرز
ناوەکەی بۆ خوێنمژان دەردێکە پڕ ترس و لەرز
فێرە مەشقێکە لەسەر بالاترین شێوەو تەرز
هێز نییە ساخۆی لەبەر بگرێ لەسەر روویی ئەرز
هێزی سوور کێوێکی سەخت و بەرزە هەرگیز نالەقێ
بۆیە هەوری شەڕ تریشقەی دێت و ئەمما ناتەقێ!

❋

هەربژی هێــزی نەبەز شــا لەشکری ســەرووی زەمین
ئەی ســوپای پارێزگــەری شــاری ســتــالین و لینین
هــەڵــکەری بــەیــداغــی ئازادی لــەبــەرلــیــنــی بــەریــن
لابــەری بــاری غـــــــەم و هـــەی دوابــڕی ئـازاری ژیــن
وا ســڵاوی مــیــللــەتی تێکۆشــەرت پێــشکەش دەکـەین
شــەربەتی شــادی بەســەر هــاوڕێ یەکان دابەش دەکـەین

بەندیخانەی کووت: شوباتی ١٩٥٢

## ئایار

ئەی ئـایـاری بـەخـــــتـــــیـــــاری
ڕۆژی چــیــنــی کـــــــــــــرێــکــاری

ڕەمـــــزی خـــــەباتی خـــوێنینی
پـــڕشـــــنــگ و ڕوونـــاکـــی ژیـــنـــی

کـــارگـــەرانی هـەمـــوو جـــیـــهـــان
ســـەرانســـەر دێنیـــتـــە جـــۆشـــان

هـانیـــــان ئـەدەی بـۆ تـێـکۆشـــــان
بـۆ لـەناوچوونی خـــــوێنـمـــــژان

بۆ مـــەرگی ئیـــمـــپـــریالبـــتـــان
نەمـــــانی کـــۆنەپەرســـــتـــــان

یـــادی تـــۆ ئـــەی ئـــیـــکـــی ئـــایـــار
یـادی هـەســـــتـــــانی کـــــرێکار

کێوی دیلی دەهەژێنێ
رەگی فاشی دەپچڕێنێ!

خوێنی ناڵی کارگەرانت
نارەقی رووی رەنجبەرانت

داری تێکۆشانی راستی
دێرا بۆ بەری سەربەستی

نایار ئەی نایاری خوێنین
هەوێنی هەوڵ و تێکۆشین

وەک شیکاگۆ، گاورباغی
بەهۆی کارگەرانی یاغی

بوو بەلانەی شێرو مەردان
بوو بەمەیدانی نەبەردان

وەک (نوگەست) و (نیکل) و (فیشەر)
فەهد و حازم و صارمی رابەر

سەریان دانا لەرێ ی ژیان
لەرێی سەربەستی نیشتمان

بەندیخانەی کووت: ١٩٥٠

# بۆ هاوڕێیانی نەمر

ئەوا باڵی ڕەشی شـوومی شـەوی ئیـرهابی ئیسـتـعـمـار
بەسـەر خـاکی عـێـراقـا ڕاکـشـا داپـۆشی شـارەو شـار
لـەپاش یەکـخـسـتـنی گـشـت جـۆرە ئازادی دیموکـراتی
بەهۆی عـورفی هـەزاران گـەنجی ئازاد پەروەرو هـوشـیـار
ڕەتێنران دەربەدەربوون، لێـدران، مـەحکوم کـران گـیـران
لەبەندیخـانەکان پەسـران بەبێ ئیسـپـات و بێ پرسـیـار
بەمـەش دوژمـن، لـەدڵ ترسی نەچۆ دەر زانی بێ سـوودە
لـەگـەڵ ئازادی خـوازانی بەکـار، بێ کـارە گـشـت ئازار
ئیـتـر هـەسـتـا پەنای خـۆی بردە بەر ئاخـر چەکی پیـسـی
لەبۆ سێ قـوتـبـەکـەی حـزبی شـیـوعی جـا لەسێ ئاقـار
چەقـانـدی داری سـێـدارە لـەچواردەی دووی چڵ و نۆدا
وەکو (بیـری)* نەمـر هاوڕێ شـەبیبی و فـەهدی جـەوهـەردار
بەسـەر کـەوتن بەسـەر بەرزی لەبۆ سـەرداری سـێـدارە
هوتافـیـان کرد بەگـیـانی مـیـللـەت و فـەوتانی ئیسـتـعـمـار
لـەبـۆ ڕۆژی دووەم هـاوڕێ زەکی بوو بـوو بـەقـوربـانی
وڵات و مـیـللـەت و حـزبی شـیـوعی کـارگـەرو جـوتیـار
بەڵێن بێ ئەی شـەهیـدی حـوریەت، ئەی فـەهدی سـەرکـردە
لـەڕێگەی مـارکـسی لیـنیـنی سـەوریدا نەکـەین ئینکار
بەڵێن بێ تا دڵۆپێ خـوێنی گـەش مـابێ لەدڵمـانا
نەکـەین دەرچین لـەژێر بەیداغـەکـەی چینی برۆلیـتـار
بەڵێن بێ تاکو یەک کـەسـمـان لـەسـەر ئەم خـاکـەدا مـابێ
لەپێناو تۆڵەسـەندنتـان بەمـاڵ و سـەربکەین کـوشـتـار

* گابریل بیری: قارەمانی شەهیدی فەرەنسە

بەندیخانەی بەغدا ١٩٤٩/٢/١٨

## لەلادێدا

لەلادێدا لەناو وەرزێر و جووتیار
لەشاراندا لەگەڵ چینی کرێکار
لەگەرمێن و لەکوێستان
لەناو پەرێزو بێستان
لەگەڵ خوێنەران
وەتمەن پەروەران
نەکەین خەبات
لەبۆ نەجات
لەنیستعمار

* *

بەبێ ترسان و راوەستان و سستی
لەزوڵم و وەحشەتی کۆنەپەرستی
لەرەنج خۆروخوێنمژان
لەزەبری میللەت کوژان
لەئێش و لێدان
زنجیرو زیندان
لەچنگ مردن
نیعدام کردن
بۆ سەربەستی

* *

دەمێکە ژێرچەپۆک و هەق خوراوین
بەهۆی بێگانە رووت و نان براوین
نەزان و گێژو وێژین
غەم و تاڵی نەچێژین
بۆ یەکتر کوشتن
دزی و خوێنڕشتن
گەلی نازاین
زۆر بێ پەروایین
دەس بڵاوین

* *

بەڵام بێ شک لەمەولا تەفرە ناخۆین
کەدەس هەرگیز لەکاری چاکە ناشۆین
تێ ئەکۆشین بێ وچان
بۆ سەربەستی نیشتمان
بەرامبەر دوژمن
رەقین وەک ئاسن
قەت کۆڵ نادەین
هەر ئامادەین
بۆ پێش بڕۆین

* *

بەهێزی شان و پیلی رەنج خوراوان
بەزەبری هۆش و بیری گەنج و لاوان
لەتاریکی هیلاکی
ئەڕۆین بەرەو رووناکی
بەرەو ئازادی
بەرەو گوشادی
بەرەو ژیان
ژینی بێ ژان
دوور لەتاوان

* *

ژیانێک پڕ لەخۆشی و کامەرانی
ژیانێک پڕ لەدادو میهرەبانی
دوور لەدزی و خوێنمژین
دوور لەناکۆکی و لەکین
دوور لەهەژاری
لەدەردەداری
دوور لەکوشتن
لەخوێنڕشتن
لەبێ نانی

بەندیخانەی هەولێر: تەمموزی ١٩٤٨

## بەبۆنەی خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆنەوە

بەفـــری زســـــتـــانی بەدوومـی ســـەد ســـوپاس تاوایەوە
مـــێـــرغـــوزار و گـــوڵشـــەنی ژین ســـەر لەنو بوژایەوە
دەنگی تەسلیم بوونی هێزی شەڕ لەگشت گۆشەی جیهان
چەشنی گـــرمـــەی هەوری نیـــســـان دەنگو ناڵەی دایەوە

ایران ٠ کرند، ١٦/٨/١٩٤٥

## پۆرسەعید

ســتـــالینگرادی مـیـســر پۆرســـەعـیـد
لــــە (تـــروادە) زۆر بـــەرزو بـــاڵاتـــرە
سوپاکەی گەلی میسری مەردو رەشید
لەمی (ئیـــدن) و (مـــۆلی) ئازاترە

*

لەبەحـــرو لەعـــەردو لەئاســـمـــانەوە
رەهێـــڵـــەی نەمـــان و مـــەحـــو بوونەوە
ئەبارێ بەبێ ســـاتێ وەســـتـــانەوە
دەڵێی تووتەشـــار چۆتە ناو تووتەوە!

*

بەڵێ دۆزەخـــــێـــكـی بەتاو و دژە
بەیەکـپـــارچە ئەو شـــارە خـــۆڕاگـــرە!
ســـەرو ســـینەو دەســت و قـــاچ و قـــژە
لەهەرلاوە خـــۆراکی ئەو ئاگـــرە

*

فــــرۆکــــەی زلی تیـــژڕەوی وەک هـەڵۆ
لـەگـــــەڵ ئاگــــرو ئاسـنی بێ ئـەمـــــان
ئـەبـارێـنـێ وەک پۆل و تـیـــــــپی کـلـۆ
چەتربازە چاوشــــینە بێ نرخـــەکــان!

*

لەبەر ئارەقـەو خـوێن و مـێـشـک و جگەر
دەرو ژوورو مــــــەیدان و مــــــەزرا قــــوڕە
ســـوپای مـــردنی ترسـناک و خـــەتەر
وەکـــــو ئاگــــرێکی بەتاو و گــــــوڕە!

*

بەڵام هـێــــــزی ئازادی، هـێــــــزی ژیان
لـەهـێــــزی ئەتۆمــــیش کــــەهێـــژاترە
لـەئاگــر، لـەئاسـن، لـەمـــەرگ و ئـەمـــان
گــــەرمــــتــــر، ســــەخت تر تووانا ترە!!

ئەم هـەڵبـەسـتـە لەپایزی ١٩٥٦دا، لەکاتی پەلامـارە سێ قـۆڵی یەکـەی سـەر پۆرسـەعـیـد هەڵبەستراوە.

## خەنجەری ناحەق

خـەنجەری ناحـەق ئەبەد جـەسـتەی حـەقـیـقـەت نابڕێ
لەشـكری شـەڕ خـۆی لـەبـەر هێـزی عـەدالـەت ناگـرێ

* بەبۆنەی ئازادکردنی بەرلینەوە، لەمایسی ١٩٤٥ لەفەلەستین گوتراوە.

# هەژارین

برا وەرزێرو جوتیارو سەپانین
بێ بەرگ و نانین
ئەگەرچی هەڵگری هەوجارو داسین
هەردەم کەساسین
لەچنگ ئاغا جگەر پارەو پەلاسین

*

زەدەی دەستی بەگ و زۆردارو میرین
بەندو ئەسیرین
بەچوار فەسڵە خەریکی ئیش و کارین
هێشتا هەژارین
نەخۆش و دەردەدارو لێو بارین

*

هەموو رۆژێ لە بۆ جووت یا سەپانی
گەردی بەیانی
ئەبێ دەرچین بەرەغمی سارد و سەرما
یانەخۆ گەرما
ئەوانیش وان لەناو جێ ی گەرم و نەرما

*

گەنم چێنین و غەیری هەرزن و گاڵ
نابەینەناو ماڵ
کەچی ئاغا بەزۆری قەندەهاری
بێ غەم دەهاڕی
لەسایەی ئێمە لیرەی بۆ دەباری

*

قــبــوڵ ناکــەین نیــتــر ئەم ژینە تاڵە
ئــەم تــەرزە حـــــــــــاڵــە
ســەرو ســامـانی خـۆ ناخـەینە بەرچەنگ
دوژمـــــنـــــی دڵ تـــــەنـــگ
هەمــوو هاوارەکـەین تێکڕا بـەیەک دەنگ

٭

هـەژارو حــەق خــوراو و رووت و برســین
ئێــــــــمــــــــە نـاتـرسـین
لەگـوللـەی خـائین و جـاسـوس و زۆردار
یاخـــو ئیـــســـتـــعـــمـــار
ئەکــۆشـین بۆ ئـەمـــانی زوڵـمـی زۆردار

٭

لـەســـەر رێگـەی رەوانی عـــەدل و دادا
ئێـــــــمـــــــە لانـادا
تەقـــەی تۆپ و زرەی زنجـــیـــرو زینـدان
مـــــــەیـنـەتـی و لـێ دان
تەنانەت ســـەربڕین و گـــوللـەباران!!

کۆیە: ١٩٤٨

# ئێمه چین؟

ئێـــمـــه چینی کـارگــەران، تێکۆشــەرانی قـارەمـــان
ئێـــمـــه چینی رابەری راسـت و جگەرسـۆزی گــەلان
بوومـەلەرزەو ناگرو مـەرگین لەگشت گۆشـەی جیهان
بۆ سـوپای دوژمن لەدەریا و رووی زەمین و ئاسـمـان
خوای بەهەشت و جاویدانین گیان ئەبەخشین و ئەژین
نامــرین چونکی لەمــردن ئێـــمـــه زۆر قـایمتـرین

*

ئێـــمـــه مـــەیدانداری ئازادین لەکـۆریا و هیندی چین
شـێـری مــەیدانین لەئێـرانا بلـێـســەی ئاگـرین
پاریس و بەرلین و رۆمـا چاک ئەزانن ئێـــمـــه چین
جـــەوهـەری شـــادین کـــەوا دەرهێنەرو داهێنەرین
لابەری سـایەی شــەرو چەسـپێنەری ئاسـایشـین
تیشک و پرشنگی خـەبات و باشـترین جـەنگاوەرین

بەندیخانەی کووت: ١٩٥٠

# ئەگەر گەرەکتە...

ئەگـەر گـەرەكـتـە شـادو تێـرو تەژی
تـــۆ بـــژی
ڕێگەیی زۆر راسـتی رەهابوونی گـەل
ڕێ ی عـەمـەل
بگرە هەتا دەرچی لەچنگ خوێنمـژی

*

دەس بەرە بۆ تۆپ وتفـەنگی خـەبات
بـۆ نـەجـات
رووکـەرە مـەیدان و بگرمـێنە جـا
ئـەی بـرا
هەروەکـو گـەنجـانی رەقی رۆژهەڵات

*

لادە لـەهواتـەی زل و داوای درۆ
رەنجـەڕۆ
پشت دەرە پشت لـەشکری زەحـمـەت
کـەشـان
بـێ بـەشـان
نیکە نەکەی خـەڵکی بکەی دەسـخەڕۆ

کۆیە: ۱۹٥۲

# یەکی ئایار

ئێکی ئایار بۆ کرێکار جەژنە پڕ ئاوات و کام
بۆ بەرەی سەرمایەداران پڕ مەترسی و لەرزو سام
زۆرترین قەوماوەکانی پێشوو بێ شک پەشمەلام
رۆژەها زۆرن لەمێژووی توخمی ئینسانا، بەڵام
ئیکی ئایاری هەزارو هەشت سەدو هەشتاو شەش
پێچەوانەی رۆژەها رسکا بەخوێنی سوورو گەش

*

هەر لەرۆژانێ کەوا رەنج خۆرو رەنجبەر هاتنە ناو
ململانێی چینی پەیدابوو گەلێ توندو بەتاو
گا، لەبەینی رەنجبەرو خاوەن زەوی زارو بەراو
گا، لەبەینی کارگەران و خاوەنی کارو دراو
ئەم لەرێگەی نان و ئازادی، لەرێی خۆشی ژیان
ئەو لەپێناو خوێنمژینی رەنجبەری بێ بەرگ و نان

*

کاتێ ئیمپریالیزم ریشەی لەئەمریکا چەقاند
تۆوی ئاکۆکی روان و داری ئاهەمواری چاند
بۆ شکانی خۆی بەخۆی شێرانی بێشەی راپەڕاند
کەڵک و سوودێکی ئەدی هەرچەند گەلێ خوێنی رژاند
خوێن و گوڵ تێکەڵ بەیەکتربوون لەئایارا برا
بۆ شەوی تاریکی تێکۆشانی گەل بوو شەوچرا

*

چۆن لەئایارا لەشیکاگۆ بەگوللەی خوێنمژان
وەک گەڵاڕێزانی گوڵزارانی بێ ئازی خەزان
گەل گەل و تیپ تیپ کرێکارانی وریا هەڵوەران
بوون بەقوربانی لەپێناو چی؟ لەپێناوی ژیان
واش لەتەمموزا لەگاورباغی دوژمن خوێنی رشت
کارگەرانی بێ چەک و بێ نان و بێ تاوانی کوشت

*

کارگەرانی خاکی ئێمەو ئەمریکا هەردوو بران
هەردوو گیرۆدەن بەدەس سەرمایەدارو خوێنمژان
هەردوویان خەڵتانی بەحری خوێنی سوورو گەش کران
قازی (ئەلبێرت گاری) (ئەعسانی) لەدووهات بێ گومان
ئەو پەتەی (نوگەست) و هاوبیرانی پێ خنکانرا
هەر ئەویش بوو (فەهدو)و هاوڕێ یانی پێ هەڵواسرا

*

تاکو ئیمپریالیزم لەم خاکەدەر نەکرێتەدەر
رۆژی وەک ئایاری خوێنینمان بەزۆری دێتەبەر
وەک لەکانوونی ئەمردا خوێنمژانی جانەوەر
شاری بەغداو دیجلەیان سوور کرد بەخوێناوی جگەر
کردەوەی (شاوول توێقی) قەت ئەمر ناکەین لەبیر
گیانی خۆی بەخشی لەبێناو ژینی بێ زنجیرو ئیر

*

یەکگرن جا ئەی کرێکارانی دنیا یەکگرن
هەڵبڕن کۆت و کەلەبچەو بەندی دیلی هەڵبڕن
داگرن بەیداغی ئیستعماری خوێنمژ داگرن
لەشکری فاشی لەهەر مەیدان و قوڵی دابڕن
هێزی شەڕ گەربێ هەمەوو زەریاو زەمینیش داگرێ
هەر شکاوەو خۆی لەبەر هێزی گەلانا ناگرێ

بەندیخانەی کووت: ١٩٥٠

## پردی ژیان

بەسەر پردی ژیانا دەستە بەدەستە ئینسان
هەتا هەتایە دێت و گوزەر نەکا بێ وچان
پردێکی سەر سورمێن و سەیرە لەسەر دوو پایە
بەندە کە بنکی هەردوو لەناخی هیچیایە
لەبەینی دوو نەبووندا ماوەی ژیان دیارە
خەبات و خۆشەویستی و ئومێد و ئێش و کارە!

کۆیە:١٩٥٩/٢/٢٢

## سوێند

بەگیانی فەهدو خوێنی شەهیدان
ناوەستین لەرێ ی سەربەستی ژیان
بەتێکۆشان و شۆڕشی خوێنین
بەرنادەین رێگای مارکس و لینین
بەرەنگی زەردی هەزاران هەزار
هەژاری برسی ئەمرێنین زۆردار
بەتێکۆشانی ئازادیخوازان
لەزیندانانی ئیسپان و یۆنان
بەگیانی بەرزی میللەتی کۆریا
پەیمان بێ هەتا مابین لەدنیا
لەقافلەی گەلان بەجێ نەمێنێن
لەکاری راستی قەت وازنەهێنین

بەندیخانەی کووت: ١٩٥١

# کوڕانی خەبات

کـــوڕانی خـــەبات و نەجـــات و ژیـان
لەرێ ی ســەربەخـۆیی گـەل و نیـشـتـمـان
لـەژێر بـەیرەقـی قــرمــزی رەنجـبــەران
بکۆشـن، بهـــاڕن قـــەڵای رەنجـمـــژان

❊

برێژن لەرێ ی راســتــیـا خـوێنی گـەش
بنێـــــژن لـەپێـنـاو ژیـانا کـــــەلـەش
بەشـــــۆڕش نەبێ دوژمـنـی جـــانەوەر
چلـۆن وازدەهـێـنـی لـەناڵـتـــوونی رەش؟

❊

ئـەوا رۆژی ئـازادی رۆژی گــــــــــەلان
بەدەرکـــەوت لـەئاســـۆی بڵـندی ژیـان
تـەمـی مــــــەینـەت و هـەوری دیـلـی دڕی
خـــــــوداوەنـدی تـاریـکی هـێـنـا هـەژان

❊

لەرێ ی ریـشـــەکـێش کـردنی رەنج مــژین
لـەپێـنـاو نـەهـێــــــــڵانـی ئـازاری ژیـن
بەرەو بەخـــتــیـــاری ئەڕۆن رۆژو شـــەو
بـەجـــارێ هـەمـــوو مـــیـلـلـەتانی زەمـین

بەندیخانەی کووت
١٩٥١/١٢/٢٠

## کاروانی گەلان

کــــاروانــی گـــــەلان وا کــــەوتـۆتـەڕێ
بـــەرەو ئـــازادی دەشـــت و دەر ئـــەبــڕێ
لـەبـەر رووناکی رۆژی ئـۆکـــتــــۆبـەر
ڕێ بـەدی دەکــــا، ڕێگـای پڕ خــــەتەر
تـۆش ئەی مــــیـلـلـەتی ئەبەردو دلێـــــر
بێ بەش لـەخـۆشی و خـەلەو خـێرو بێـر
بەندو بەسـراوی دەسـتی ئیـسـتـعـمـار
گـــیـــرۆدەی دەردی برســـێـــتی ناچار
رۆلانـت کـــــــەوا بـەنـدی زیـنـدانـن
پێـشــمــەرگــەی راســتی ڕێگەی ژیانن
بـۆ بەرزی تـۆیە کـــــەتێ ئـەکـــۆشــن
پیـــاڵەی مــــەینەت و مـــردن ئەنۆشــن
خـــێــراکـــە خـــێـــرا ئەی تینووی ژیان
بـەجێ نەمـــێنی لـەقـــافـــڵــەی گـــەلان
لـەقـــافـــڵـــەی نان و ئاشـــتی و ئازادی
لەقـافـڵـەی بەرزی و خـۆشی و دڵشـادی

بەندیخانەی کووت: ۱۹۵۱

# هەندێ كەس

هەندێ كەس راستی بەخوار تێ ئەگەن
ئەغیاری میللەت بەیار تێ ئەگەن
كتێبی عیلمی و ئازادی ئەفكار
بەئینسان خۆركەو خونخوار تێ ئەگەن
پیاوی چالاك و گەنجی مێشك روون
بەگەل فرۆش و بەدكار تێ ئەگەن
ئینسانی راست و ئازادی پەروەر
بەشێت و هێڕ و بەهار تێ ئەگەن
هەوڵ و تێكۆشین بۆ سەربەستی و نان
بەشەرم و سووكی و بەعار تێ ئەگەن
ئیشكردن لەرێ ی خۆشی ئینسانی
بەزۆری و سوخرەو بێگار تێ ئەگەن
پیاوی تەمبەڵ و نەزان و بێ هۆش
بەپیاوی باش و هەژار تێ ئەگەن
خۆ هەڵكیشان و دیعایەی درۆ
بەتێكۆشین و كردار تێ ئەگەن
خوێنرێژەكانی پیاوی بێگانە
بەگەورەی گەل و سەردار تێ ئەگەن
دینار دزانی ئاشكرا بەرۆژ
بەحاجی و شێخ و دیندار تێ ئەگەن
ریشوەت خۆرانی سەر تەخت و كورسی
هەر بەئەفەندی و سەركار تێ ئەگەن
چلەی زستانی مەینەتی میللەت
وا بەنەورۆزو بەهار تێ ئەگەن
خۆ حەلكردنی مەسەلەی كوردان
بەمەشروب نۆشی و قومار تێ ئەگەن
راستی گوفتارو ئەسڵی حەقیقەت
لەشیعرەكانی ( دلزار ) تێ ئەگەن

كۆیە: ١٩٤٧

## ژن

ژنی بەد ژان و ژەنگی ژیانە
گەر خۆتی لێ دەی ماڵت وێرانە
برای شیرینم جوانی خوڵقو خوو
بەکاری تۆ دێ نەک هی رەنگ و روو
ژنێ پەسەند کە رەوشتی چا بێ
چالاک و خێرا ژیرو زانابێ
هاوڕێ ی ژیان و هاوڕێ ی بیرت بێ
لەبەندیخانان هاوزنجیرت بێ
لەکۆبوونەوەو هەراو هەڵچوونا
لەرێی ئازادی و سەربەخۆبوونا
هەردەم ئامادەو شا بەشانت بێ
لەتەنگانەدا پشتیوانت بێ
هەروەکو (تانیا)و (ژاندارک) و (خانزاد)
لەرۆژی شۆڕش دوژمن کا بەرباد

* *

منداڵی بچووک زۆرباش بەخێوکا
نەک بیترسێنێ و هاواری دێوکا
سەری شەتەک داو دەستی ببەستێ
هەر گریا مەمکی لەدەم بپەستێ
بەشەو لەبان و ئایشە گوێ درێژ
زراوی بەرێ بیکا گێژو وێژ

* *

دایکێکی وابێ خەریک بێ هەردەم
رۆڵەی بەقیمەت بێنێتە بەرهەم
مێشکی بەبیری بەرز ئاو بدا
تاریکی جەهل و قینی قاو بدا

ئـامـــــــــادەی بـکـا بـۆ بـەرزی وڵات
بۆ نـەهێــشـــتنی بەڵاو کـــارەســـات
بۆ خـــۆش کـــردنی ڕێگەی دڵـشـــادی
بـــۆ هـــەڵــکـــردنـــی چـــرای ئـــازادی
بۆ وەرگــــێـــڕانی قـــــەڵاتی زۆردار
بۆ دەرهێنانی ڕەگی ئیـســتـیـعـمـار
بـۆ ژیـانـێـکـی پڕ کــــــامـــــــەرانی
بۆ خـــزمـــەتکردن لەڕێ ی ئینســـانی

کۆیە: ١٩٤٧

## لەهەق لادان

هەندێکی وا نەبینم
خاوەن ڕیش و سمێڵن
کەچی لەژێرو بیرا
وەک کەرو کارو چێڵن
ڕێگەی تاریکی نەگرن
شەقامی هەق جێ دێڵن
ڕاستی لەراستی دوورن
نەزان و گێژو گێلن!
بەخوا بێ سوود پەلەکوتن
لەجەهلا قووڕ نەشێلن
پف لە خۆڵەمێش نەکەن
تاویرە بەرد نەکێڵن
لەشەستەبارانی ژین
لەژێر ڕێژنەو رەهێڵن!
بەرامبەری حەقیقەت
سەیری چەند خوارو خێلن
خەریکی هەڵێنجانی
ناوی سەرچاوەی لێڵن
بۆ خۆ قەبر نەکۆڵن
کەدەس بە پاچ و بێڵن!

کۆیە: ١٩٤٧

# پێکەنینی بەهار

پارچە هەڵبەستێکی ڤیکتۆر هۆگۆیە

وا گـــــــەڕانـەوە رۆژە درێـژەکـــــــان
بەجـۆش و خـۆشـی و رووناکی پـەخـشـــان
ئـەمـــــەیە بـەهـار، ئادارو نـیـــــســـــان
هـاتن پێـکـەوە رووخـــۆش و خـــەندان
ئایاری گـــوڵ و مـــانگی حــــەزیـران
پاکن، بەناون، جـــوانن هـەمـــوویان
وا چـنـار دەرکـــــەوت لـەدەم رووبـاران
بایـی بە باڵای وەک چـاوخـــومـــاران
لەجـەرگەی بێـشـەو جەنگەڵی بێ هـەست
مـەلان خـەریکی سـەیرانن سـەرمـەست
وەک بڵێ ی دنیـــا بـەشـــادی درەخـت
وا پێ ئـەکـەنێ گـوشـادە خـۆش بـەخـت!
بەرگـێکی ســـەوزی نایاب و جـوانی
پۆشـیـوە مـەسـتـە بەکـامـەرانی !
هـەردووک پێکەوە وەک بەخـتـیـاران
دڵـداری ئـەکـــــەن وێـنـەی دڵـداران!
رۆژ دەمــــەو بەیان هـەروەک تاجی زێڕ
هەڵدێ لەکـێـوان لەسـەر لووتکەو لێـڕ
ســەر لەئێـواران وەخــتی ئاوابوون
دەڵی ی عـاشـقـە، عـاشـقی مـەفـتوون
لـەناو ئـاســـمـــانی پێـکـەنیـناوی
ئـەبریقــێـتـــەوە مـــانگ بەتـەواوی
ئەدا لەگوێچکەت، هەمـوو سـات و کـات
گـــۆرانی شــــادی و ئاوازی ئـاوات

کۆیە ١٩٥٦/١٠/١٣

# مانگەشەو

مانگی خشت لەناو جەرگی ئاسمانا
ئەدرەوشێتەوە
با بەسەر جۆگەی روون و رەوانا
سووک ئەشنێتەوە
وردە شەپۆلی سەر گۆلاوی مەند
بەسروەی ئەسیم
ئەڵێ ی زرێ یە دەستی هونەرمەند
ئەی چنێ لەسیم
چەم و چیمەن و باخ و کەپری جوان
سەرتا بەخواری
لەناو تریفەی مانگی نوور پەخشان
نوقمن بەجاری
چاوی سیحراوی خوای عیشق و جواتی:
ئەستێرەی رەوشەن
لەگەڵ چیمەن و تیپی گوڵانی
چاوشارکێ ئەکەن
بێجگە لەدەنگی مۆزیقای رووبار
نابیسی چپە
هەرچی ئەی بینی بێ گیان و گیاندار
بێ هەست و کپە
لەگەڵ تریفەی ئەو مانگە هەستێ
هەتا حەزکەی خۆش
ئەچێتە ناو دڵ ئەمکا بەمەستێ
ئەمهێنێتە جۆش

کۆیە: ١٩٥٧/١١/١٢

# هەست كردن (*)

لەژێر ئاسمانی شینی بەهارا
بەناو گوڵزارا
ئەڕۆم ئەشێلم گوڵاڵەو گیا
شادو دڵنیا
بێ ئاگا لەگشت رووداوی دنیا

*

هەست بەتەڕیەتی سەرقاچم ئەكەم
بەشەونم كەم
لەخەوبینینم غەرقی خەیاڵم
وەكو منداڵم
هیچ قسە ناكەم وەك بڵێ ی لاڵم

*

بیرناكەمەوە ئەكەم و ئەزۆر
بەهیچ ڕەنگ و جۆر
بەڵام خۆشەویستی بێ حەدو سنوور
وەك شەپۆلی نوور
دێ بەرەو ئاخی گیانی من لەدوور

* شیعرێكی (رامبۆ) بۆتە سەرچاوەی ئیلهامی ئەم پارچە شیعرە.

كۆیە: ١٩٥٦/١٠/١١

## لافاو

رشتی بەسەر خاکی وەتەن
خوای تاریکی و شەڕ: ئەهریمەن
قارو قین و خەشی رەشی
مردن، هەژاری، بێ بەشی
بەهەوری پڕ لە تاوانی
کەوتە گیانی سلێمانی
بەتەرزێ دای گرت بە تەرزە
کەنەیبینی بوو ئەم ئەرزە
هەروژمی بارانی بەتاو
کوێرە شیوی کرد بە شەتاو
لەگوێژەوە هەستا بەخوڕ
لافاوی مەرگ بەتاو و گوڕ
وەک دێوی شێت وەک ئەژدەها
کەخۆی لەبەند کردبێ رەها!
خۆی کرد بەناوشارا بڕی
هەرچی کەوتە پێشی دڕی
رمانی، خنکانی، بردی
هەرچی لەدەستی هات کردی
بێ ئەندازە زیانی کرد
هەتا بڵێی تاوانی کرد
کۆرپەی ئیسک سووک و جوانی
لەباوەش داکی دەرهانی
کیژۆڵەی قژزەردو کاڵی

بەکۆمەڵ بۆ شیو رامالی
دایک لە کۆرپەی ئەگەرا
کەچی لادیوار لەپرا
ئەرما بەسەریا ئەی مران
لەژێر دارو پەردووی گران
تێکرا، ئەرز، ئاسمان، ئینسان
بەخورەم بەتاو ئەگریان!
ئەم بەلافاو ئەو بە باران
ئەویان بەفرمێسکی رەوان
ئەهریمەنیش لەوکاتەدا
سوری سەرمەستانەی ئەدا
سەمای سەرکەوتنی ئەکرد
تانەی ئەدا لەقەومی کورد
بەگریانی سک سووتاوان
بەنووزەی بێ داک و باوان
بەتەرزێ ئەشەدار ئەبوو
کەزوو زوو گەشکەدار ئەبوو
زۆری ئەبرد ئەم دیەنە
سەرخۆشی ئەم ئەهریمەنە
ئاهورە مەزدای میهرەبان
خوای چاکەو رووناکی و ژیان
هات و ئەهریمەنی بەزاند
نیرووی شەرو شومی شکاند
فرمێسکی ئاسمانی سری
هێزی لەبەر لافاو بری

ئەمجارەش شاری قارەمان
دڵی کوردستانی جوان
کەوتە بەرهەڵمەتی زەمان
هەڵمەتی ئەرزو ئاسمان
بۆ سەرپێندا ئەواندنی
لەبۆ شکۆ شکاندنی
بەڵام شای شارانم هەرگیز
کۆڵنادات و ناچێتە ریز:
شارانی تەفرو توونا بوو
ئەگەر هێزی شەڕیش هەموو
ئەرزو ئاسمانی داگرێ
مەرگی بەرامبەر راگرێ
چونکە دڵی کوردستانە
ئەمرەو نامرێ و جاویدانە

کۆیە: تشرینی دووەمی ١٩٥٧

## کوردستان

کوردستان جوانی نێجگار شیرینی
بێ شک بەهەشتی سەرڕووی زەمینی
خاوەن غیلمان و حۆری نەخشینی
دایم رازاوەو جوان و رەنگینی
هەویێنی ژینی
سەراسەر شاخ و باخ و گوڵزاری
پڕلە سۆلاڤ و کانی و رووباری
یانەو هێلانەی قومری و هوزاری
نەخشاوی دەستی پەروەردگاری
بووکی بەهاری
دایکی دڵنەرمی رۆڵەی کوردانی
لانەی شێرانی زەندو بابانی
خاکی کرمانج و زازا و سۆرانی
راوگەو هەوارگەی لوڕو گۆرانی
جێی ئەردەلانی

کۆیە: ١٩٤٦

## سولاڤ

ئەملا کەژێکە    ئەولا کەژێکە    جوان و سەخت و بەرز
لەناوەڕاستا    دۆڵی سۆلاڤە    پڕ لەباخ و ڕەز
لەهەرلا چڵە    ئەغمەی بولبولە    خۆش و دڵکێشە
شنەی شەماڵە    کانگەی خەیاڵە    دوور ئێش و ئێشە
لەپاڵ هەر بەردێ    لەقەد هەر گردێ    ئاوازێ دەردێ
هی کەو و سویسکە    کەغەم ناهێڵێ    لەسەر دڵ گەردێ
لەرۆخ زار گەلی    مەزروکە ئاوێ    بەقەد رووبارێ
بەتاو هەڵەقوڵێ    ساردو سازگار    ئەخشێتە خوارێ
وەک مار بۆ جەنگەڵ    ئەخشێ بەجینگڵ    بەپێچ و دەورە
بەتیشکی زێڕین    ئەدرەوشێتەوە    لەو دۆڵە گەورە
لەعاستی ڕێگەی    قیرتاو زۆر بەتاو    بەوێنەی سۆلاو
ئەرژێتە خوارێ    بۆ دۆڵێکی قووڵ    وەک شیری رژاو
پریشکی پاکی    کەپەخشانەکا    بەسەر سەوزە گیا
ئەڵێ ی مرواری و    وردە لوئلوئە    پێ ی داوە دەریا!

کۆیە ١٩٤٨

## شیعرو خەیاڵ و جوانی

لەژێر سـێـبـەری رووناکی رۆژا لەدەم روبارێ
بەپێکی پاکی و خۆشاوی خۆشی مەست بووم بەجارێ
ئەسووڕامەوە بەسەر بەحرێکی سپی و سافی نوور
رای ئەدام بەرەو سەرچاوەی ئاوات شەپۆلی شعوور
دەنگێکی سپی عاتیفە لەرزێن وەک سیحری حەلال
ئەهاتە بەرگوێم کەوا ئیلهام بوو ئیلهامی خەیاڵ
ئیلهامی پەری شیعرو جوانی بوو لەئاسمانی فەن
لەسەر شەپۆل و لەرەی رووناکی بۆم ئەهات بەن بەن
بەشارەزایی لە لەوحی خەیاڵ وەک لەوحی فەننان
زۆر بەوەستایی ئەمکێشا ئەخشی هەڵبەستی جوان جوان

## نەورۆز

مژدە لەم گەل و هۆزە
زەمین بۆتە پیرۆزە
رۆژێکی زۆر پیرۆزە
جەژنی نەورۆزە
جەژنی قومری و هوزارە
کژی گوڵ و گوڵزارە
دەشت و دەر مێرغوزارە
تازە بەهارە
چەمەن جوان و رەنگینە
هەوا پاک و عەترینە
مێرغوزار گەش و شینە
هەوێنی ژینە
گوڵ لەگوڵشەن خەمڵیوە
بەرگی داخی دڕیوە
بۆ بولبول پێ کەنیوە
شادی کڕیوە
لەبن چڵی چناران
لەژێر سایەی هەناران
لەدەم باخ و رووباران
پۆلی نیگاران
وەک گوڵاڵە پەخشانن
بزوێنەری دڵانن
گوڵی چڵی ژیانن
ئارامی گیانن
لەناو گوڵان وەکو هەنگ
یا پەپوولەی رەنگاو رەنگ
ئەو ئەهڵانی قەشەنگ
جوان و شۆخ و شەنگ
هات و چۆیانە شادن
واتێ ئەگەن ئازادن
لەناوچەو جەرگەی دادن
کاوە نەژادن

بەندیخانەی کووت: ١٩٥٠

# پەپوولە

ئەی پەپوولەی رەنگاو رەنگ
ئەی جوانتر سەدجار لەمەنگ
باڵداری رۆح سووکۆکە
بێ وەی تر لەکۆترۆکە
تۆ رەمزی ئاسایشی
شایانی ستایشی
سەرفیرازو ئازادی
کامەران دڵشادی
دەم لەناو دەمی گوڵی
واتا لەژوور بولبولی
بێ گومان و بێ درۆ
لەو کامەرانتری تۆ
کام گوڵ گەشەو بۆن خۆشە
شلک و ناسک و تەرپۆشە
ئاونگی لەدەم نەتکێ
شۆخ و شەنگی لێ ئەچکێ
ئاواتەخوازە هەردەم
دەمت بنێ لەناو دەم
کەواتە باڵداری جوان
دۆستی دڵسۆزی ژیان
بۆ خۆشەویستی و ئاشتی
پەیامبەرێکی راستی!

کۆیە: ١٩٥٢/٨/٢٠

# بولبول

بولبول بولبول
لەناو گوڵزار
ئەتۆ بۆ گوڵ
من بۆ نازدار
بگرین بەزار
بگرین بەکوڵ
من لەژێر دار
تۆ لەسەر چڵ
تۆ بەدندوک و من بە دەم
بگرین بڕێژین ئەشکی چەم
بولبول بولبول
بگرین بەکوڵ

* *

دەندووک بچووک
بولبولی جوان
ئەی نیسک سووک
ئەی نەغمە خوان
تووبی یەزدان
بەنەغمەی خۆش
دڵی بریان،
بهێنەجۆش
تۆ بەباڵ و من بەخەیاڵ
ئەفڕین بەسەر گوڵزار و یاڵ
ئەفڕین ئەگرین
ئەسرین ناسڕین!

کۆیە: ١٥/١١/١٩٤٦

# مانگی گوڵان

مـــانگی گـــوڵانه، گـــوڕەی بـەهـاره
زەمـین ســـــەراپا باخ و گـــوڵـزاره
مـافـووری سـەوزی هـەردان گـوڵ گـوڵه
گـوڵشـــەن بەجـاریٚ پڕ لـە بولبـولـه
ســـەراپا شـــاخ و باخ و دۆڵ و دەشـت
چاو ئەندازێکن لـەباخـچـەی بەهـەشـت
پۆلی کـەنیـشک و دەسـتـەی دڵداران
هـاتوچـۆیـانـە لـەناو گـــــوڵـزاران
مـنـداڵانـی ورد وێـنـەی کـــــارژۆڵان
پەرت و پەخـشـانن لەناو مـێـرگـوڵان
گەلەی گاکێـوی و کەروێشک و ئاسکان
پـەرتـانـن بـەدەم هـەڵـدێرو بـاسـکان
ئاوی کـانیـاوی سـاردو سـازگـار
لـەژێرو قـەدی کـێـوان دێتـەخـوار
رووبار وێنەی مـار بە جـینگڵ ئەخـشیٚ
بەپێی جـێگاکـەی دیمەن ئەبەخـشیٚ
لەلایێ شـەپۆل شـڵپـە شـڵپ ئەکـا
لـەلایێ ئاگـرکـڵـپـە کـڵپ ئەکـا
لایـێـکـیـش گـــــردو هـەورازو رازه
دامــێـنـی جــێگای بازی سـێ بازه
وردو درشـــت و کـــچ و ژن و ژاڵ
منداڵ و گـەورەو پیـاو و کـوڕو کـاڵ
گشـتی سـەرخۆشی جوانی سـروشتن
بەرامـبـەر ئەغـمـەی بولبـولان وشـتن!

کۆیە: بەهاری ١٩٤٨

## ئەرێ کردگار!!

ئەرێ کــــردگـــار ســـا ئەم دنیـــایە
ئـەم ئاســــمــــان و زەوی و زەریایـە
ئەم مــەوجـوداتەی بێ گـیـان و گـیـاندار
کـــەی پەیاکـــرا، بۆ هاتـە کـــایە؟!

* *

تاکـــەی شـــەو دادێ و ڕۆژ ئەبێـــتـــە؟
تاکەی خۆر هەڵدێ و مـانگ ئەشـرێتەوە؟
تاکـەی بەهـار دێ و گـوڵ ئەکـرێتـەوە؟
بەفـــرو ســـەهۆڵی کـــەژ ئەتوێتـــەوە؟

* *

ئاخـــــۆ کــــائنات هـەتا هـەتایێ
هـەر ئاوا ئـەبێ قــــەت دوایی نایێ؟
ئەگـــەر دوایی بێ چۆن و کــــەی ئەبێ؟
فــــەرقی چی دەبێ لەگـــەڵ دنیـــایێ؟

* *

بەقـیـمـەت ترین گـەنجی مـەوجـودات
کـــەوا ئینســـانە، بۆچی کـارەســـات
ســـــەری لێ ئەداو زوو ئەی مـــرێنێ
ئەیکا بەخـــۆراک بۆ کــــرم و ئەبات؟

* *

کـــەواتە ئینســـان بۆ بێـــتـــە دنیـــا
ئەگـــــەر لەدنیــــا ئـەبێ دڵـنیــــا؟
تەنانەت ئەڕژی بـەقــــــەد درەخــــتێ
یا پنجێ گـــیــــا لە چۆڵ و چیـــا؟

* *

بێ کــــەمــێ ئاگـــــا لـەتاری و نـەبوون
ئینسـانـت هێنا بۆ رووناکی و بوون
دیـســان بێ ئاگــا، بە رووت و قــووتی
دەیخــەیە چاڵی تووناو بوون و چوون!

* *

لەکــاتی هـاتن، لەسـاتی چـوونا!
لـەوەختـی ژیان لـەدنیـای دوونا،
لەهەرسێ باران بێ خـەتا و سـووچە
واتــا لــەژیـن و بـوون و نـەبـوونـا!

کۆیە: ١٩٤٦

## دڵ و دڵزار

**فەلەستین: تەمموزی ١٩٤٥**

**دڵ:**

دڵ دەڵێ دڵزار لەبۆچی سینە کورەی ناگری؟
بۆچی فرمیسکت بەسروەی بەحری نەبیەز ناسڕی؟
بۆچی داری غەم بەتەوری کەیفو شادی نابڕی؟
بۆچی بەرگی زیللەتت سەرتا بەخوار دانادڕی؟
بۆچی ڕێگەی ڕەوشەنی ژینی بەرز داناگری؟

**دڵزار:**

ئەی دڵا بای حەرو بەڕ ئەشکم وشک ناکاتەوە
باخی ڕەنگینی فەلەستین دڵگەشیم ناداتەوە
کێوەکەی قودسی موقەددەس مەینەتم ناباتەوە
حەسرەتی دووری وەتەن خوێنی جگەر دەخواتەوە
ناعیلاجم غەم دەخۆم کەس غەم لەبۆ خۆی ناکڕی

**دڵ:**

باشە گەر تۆ ڕاست ئەکەی بۆ چ ئەو غەمەت پەیدادەکرد؟
بۆچی لەوخاکی بەهەشتی کورد گەلەت حاشا دەکرد؟
بۆچی بەقسەی ناحەزو بەد خۆت وەها ریسوا دەکرد؟
بۆچی سیرەی خۆت لەخاکی غوربەتا تونادەکرد؟
رابەری لای خۆت لەزۆر کەس ماهیرو زاناتری!

**دڵزار:**

گەر مقەددەر هات مرۆ بێ هۆش و نابینا دەبێ
سەد هەزار جار مورشیدو رابەر بێ هەر گومڕا دەبێ
راستە ڕێش بگرێ گەلێ جار تووشی چاڵی وا دەبێ
دووبەشی عومری لەناویا بەخت ئەکاو توونا دەبێ
چەشنی مردووی دێ بەسەر هەرچەند بە دیمەن نامرێ؟

# گوڵی تەمەن

**گوڵی تەمەن**

لەسەر خواستی برایانی بەڕێزو خۆشەویست دکتۆر عزەدین مستەفا رەسووڵ و کاکە حەمەی مەلا کەریم ، لەپایزی ۱۹۷۸دا، لە ماڵی خۆمان لەهەولێر، ئەم کۆمەڵە هەڵبەستە ێنکەم بۆ چاپکردن ئامادەکردو کاک محەمەدی مەلا کەریمیش لەگەڵ خۆیدا بردیە بەغداو :وای دوو حەفتە رەزامەندی رەقابەی وەزارەتی راگەیاندنی لەسەر وەرگرت و بۆی اردمەوە، بەڵام ئەوسا بۆم نەکرا بەچاپی بگەیەنم و لەپاشانیش باری وڵات بەرەو ناخۆشی ۆڕاو تیرۆرمان گەیشتەسەرو ناچار خۆم گەیاندە باوەشی کێوە سەرکەش و سەختەکانی کوردستان و دواییش رۆژ بەرۆژ باری وڵات بەرەو خراپتر دەچوو... بۆیە باوەڕێکی وام هەبوو کەتازە ئەو چەپکە گوڵە جوانانەی تەمەنم هەڵوەری و نەما، کەچی خۆشبەختانە :وای چواردە ساڵ(گوڵی تەمەن) هەر بەگەشی، لەهەولێرەوە گەیشتە ستۆکهۆڵم و وا ەگەڵ ئەم (دیوانە)دا بەتەمای چاپکردنیم.

دڵزار

ستۆکهۆڵم: ۱۹۹۲/۱/۲۹

## سەد بریا

زمـــــانـی یـاری مـن رووسـی و
نـــەمـــن رووســی چ نــازانم،
دە ســـەد بـریـا زمـــانـی ئەو،
لـــەنـاو زاری مـــنـا بــوایـــە!

## ناسک

ئەی ناسک، ئەی کـچـی جـوانی شـەنگ و شـۆخ
ئـەی چـاوگـــەشی، ئـەبـرۆ رەشـی تـێـــرو تـۆخ
بـالا بـەرزی قــــەد بـاریـکـی ســـوریـن پـڕ
گـــەردن بلـوور سـنـگ نـەرم و نـۆڵ مـــەمـک خـڕ
ئـەی لارو لـەش نـەرم و ســپـی و ســـاف و لـووس
چـەپـکی کـــەزیـت ئـاوریشـــمی رەنگ ئـابـەنووس
ئـەی ئـەو شـــۆخـــەی کـــەدەنگی مـــۆزیـقـــایە
رەوت و رەمـی شــیــرینـتــرین ســـەمـــایە
روخـــســـاری تۆ بـەم شــیـــرینی و مـــەندی یـە
تـابـلـۆیـەکـی بـەرزی هـونـەرمـــــەندی یـە
پـەیکـەری بێ کـــورت و کـــەمی و خـــەوشی تۆ
پـەیـکـەری فـــیـنـۆســـە دەســـا بێ درۆ
ئـای کـــە چ ســـەوداســـەری ئەم جـــوانی یەم
هـەڵـیـنجـــەری کـــەوســـەری ئەم کـــانی یەم
لـــەهـــەر دەمـــێ لـــەهـــەر دەرێ ئـــاوت بـێ
دڵـەی مـنـداڵ و شـــێـــتم دادەخـــورپـێ
جـــا ئـەی ئـاسـک، ئـەی ئـازەنـین، ئـەی نـیـگـار
ئیلهـــامـــدەری شــیـــعـــر و خـــەیاڵی دڵزار
تـا مـن مـــابـم، تـا شـــیـــعـــری مـن بمێنێ
جـــوانیـت لـەیاد، لـە شـــیـــعـــرمـــدا دەمـــێنێ!

قەڵادزێ: ١٩٦٥/١/١٥

## مەڕەنجێنە (*)

مردم بەسۆی زامی کولّم مەڕەنجێنە دلّم گولّم
سوتام بەجارێ
لەنالّینم رۆژو شەوێ دلّ لەفیراقت ناحەوێ
چاو لە رێ ی تۆیە ناخەوێ مەڕەنجێنە دلّم گولّم
سوتام بەجارێ
لەعیشقی تۆ پشتم چەما شادیم لەدلّ دەرچوو نەما
قەلاّتی ژینم لێ ڕما مەڕەنجێنە دلّم گولّم
سوتام بەجارێ
نالّینی من هوزاری یە دلّزارم پیشەم زاری یە
خوێناوی چاوم جاری یە مەڕەنجێنە دلّم گولّم
سوتام بەجارێ

* عەبدوڵلا تەهاو محەمەد عەلی نانەکەلی، لەسەر ئاوازی (افرح یاقلبی) کەلسومیان دەگوت، بەلاّم(عەلی مەردان) لەسەر ئاوازێکی کوردی دەیگوت، کەخۆی دایانبوو.
لەسالّی ١٩٤١ دانراوە.

# گیانە گۆڕاوی

گیانە گۆڕاوی،
گیانە گۆڕاوی
لەسەر پەیمانی پێشوو نەماوی
من دڵێکم بوو بولبولێکم بوو
لەسەر چڵی ژین سوور گوڵێکم بوو
ئەو گوڵەش تۆ بووی خۆش رەنگ و بۆ بووی
لەبۆ ژینی من واسیتەو هۆ بووی
کەچی نازانم روحی رەوانم
لەسەرچی تۆرای دەردو دەرمانم
فیتنەت بەرپاکرد، منت شەیداکرد
نازارو ئەرکت بۆ من پەیداکرد
هەرچەند دەتبینم گیانی شیرینم
دڵم دسووتێ و دەرژێ ئەسرینم
تەسکینم نایە بەپێکی شەراب
بەدەنگی تارو کەمان و روباب
دڵم کەبابە، ئەشکم شەرابە
غەمم رەفیقە، نالەم روبابە
لەیانەی مەینەت ئەژیم بە زیللەت
ئەرێژم ئەشکی پڕ سۆزی حەسرەت
ئیتر دڵزارم، بۆ تۆ هوزارم
هەمیشەو دایم، خەریکی زارم!

حەبانیە: ١٩٤٤

## ڕەشماڵ

ئەوەند جــوان بوو لـەناو گـــوڵزارێ، ڕەشـــمـــاڵ
بـەوێـنـەی کـــــولـمـی یـارو دانـەیی خـــــاڵ
لەناو گـیــاو ســوسـن و گـوڵ ئەتگو نەقــشــە
ئەمـــیـــان رەش ڕەنـگ و ئەویان ســـەوزو ئەو ئاڵ
لـەوەســـفی شـکڵ و شـــێـــوەی شـــیـــرینی ئەو
عـــــەقڵ حــــەیران قـــەڵـەم وەڕســـە زمـــان لاڵ!

کۆیە : ١٩٤١

## ناوبانگی ژن

ناوبـانگی ژن مـــــینای بێ گـــــەردە کـــــاتێ
تـەم دەیگرێ، هـەنـاســـــــە گـــــەر بیـگاتێ!

# باڵا بەرزی نەرم و شل

ئەی باڵابەرزی نەرم و شل
ئارامی گیان و جەرگ و دڵ
بەغەمزەی چاوی پڕ لە کل
تەوقی سەوداتم کەوتە مل
جا نازەنین
حۆری زەمین
مەرهەمی برین
تاکەی زاری
تاکەی گریان
جگەرسوتان
بومە بریان
بەیەکجاری

* *

وەک شەم سوتام توامەوە
هێزم نەما کوژامەوە
لەتاریکیدا مامەوە
بەیادی تۆ بووژامەوە
چەشنی بولبول
بۆ خونچەی گوڵ
کەوتمە غولغول
بێختیاری
زینی زەمان
هێزی دڵان
ئارامی گیان
بەس نەیاری

* *

بەس دڵ ئەنجن ئەنجن بکە
سینەو جگەر کون کون بکە
رێگەی دڵڕەقی ون بکە
رەحمێ بەحاڵی من بکە
بۆ تۆ نەمام
ئەی نەونەمام
پیربووم چەمام
بەناچاری
ئەشکی رەوان
رەنگ ئەرخەوان
رۆژو شەوان
نەبێ جارێ

❊ ❊

شۆخ و شەنگی هۆزی کوردم
بەداخی عیشقی تۆ مردم
چاوی رەشت شێتی کردم
عەقڵی سەندم، هۆشی بردم
دیدە مەستی
دڵ دەبەستی
نەقشی دەستی
کردگاری
تیری موژان
خوێنمی رژان
تۆ بێ گومان
جادووکاری

کۆیە: ١٩٤٥

## فیدای شاتانی

فـــیـــدای شـــاتانی شـــەنگی بـەژن و باڵات
چنار و عـــەرعـــەر (* *) و ســـەرو و سنەوبەر
بەقـــوربانی دووچاوی مـــەست و كـــاڵت
گـــەلاوێژو ســـوهەیل و مـــانگ و نەخـــتـــەر
بەبێ رەنگن بەرامـــبـــەر رەنگی كـــوڵمت
گـــوڵی نیـــســـان و لالـەی ناڵ و شـــەســتـــپـــەڕ
نـەزیـری زارو لـــێـــــــــو و دانـــی تـــۆیـــە
گـــوڵی پڕ شـــەونم و یاقـــووت و گـــەوهـەر
نەزانم گـــەر بكەم تەشـــبـــیـــهی زوڵفت
بەرەیحـــان و خـــەیاتەو مـــیـــسـك و عـــەنبـــەر
نیـــتـــر حـــۆری بەهـەشـــتی باغی كـــوردی
هـەزارانت بەدڵ مـــەجـــبـــووره یەكـــســـەر
بـریـنـداری خـــــــــەدەنـگی تـۆیـە دڵـزار
نـەزامـــاری تفـــەنگ و شـــیـــرو خـــەنجـــەر!

کۆیە: ١٩٤٦

* شاتان: جۆرێكی زۆر باشە لەسپیندار.

* * عەرعەر: سەروی كێوی، درەختێكی جوان و نەستوورە، تا ١٠ مەتر بەرزدەبێ، بەڵام عەرعەری ئاسایی نیە كەبەژنی نیەو تەنیا چڵ و پۆیە.

# بەیەک گەیشتنێک

نیگاری نازدار، بەلارو لەنجە
هات لەدڵ دەرکا، ئێش و ئەشکەنجە

هەروەکو جاران، لەباخ و رەزان
لەگەڵ دەستەیەک لەلیو قرمزان

گەڕا تا گەییە لای من ئامێستە
پێ ی راگرت وەستا، بەو چاوە مەستە

کەوەک نێرگزی کاڵ و کەژاڵە
تێرم تێ ڕاما ئەو خوردە ساڵە

ئەو خوردە ساڵەی کەبێ دیعایە
شوعلەی کوڵمانی وەک شەوچرایە

بۆ سووتانی دڵ، چەشنی ئاگرە
هەرچەند لەپەڕەی گوڵ ناسکترە

لەشۆخ و شەنگی و جوانی بێ غایە
تا ئەسمەرکەی بەرزو بالآیە

« ئاوریشم گرتن پەنجەی دەگوێنێ
کەزەی با گۆنەی دادەڕووشێنێ» *

قژە جوانەکەی زەردو پەخشانی
بەسەر لاجانگ و دەوری کوڵمانی

وەک پــرژەکـــــــــــانی رۆژ لــەنــاوابــوون
چاو دەنەنگوێ و دڵ دەکـــا مـــــەفـــتــــون

مـــنـــيـــش چـــاوێــکـــم بـــرِيـــە چـــاوانـــی
بەزمـــــــانی عـــــيــــــشق زۆر بـەرِموانـی

نـەهـێـنـی دڵـيـم لــەديـدەکـــــــــــــانی
يەک يەک خـــوێندەوە ســـەرپاکـــيم زانی!

زانيم کـــــەئەويش، ئەو گـــــۆنا گــــوڵـە
وەک مـن گــــــيــــــــرۆدەی نـازاری دڵـە

زانيـم ســــــووتاوی گـــــرِی ســــــەودايـە
ســـــــەودای دڵـداری وا لــەســــــــــەردايـە!

لـەپاش ديـدەنی و ئەو گـــــفــت و گـــــۆيـە
هـەريـەک بـەلايـەک چـووينـەوە کـــــــۆيـە

ئەو لەگــەڵ دەســـتــەی دەســـتــە خـوشكانی
مـن لــەگـــــــــــەڵ دڵـەی زارو بـــريــانـی

کۆيە: ١٩٤٦

## وەرە

وەرە ئەی نیگاری دڵ و دینەکەم
توخوا ئەی گوڵی سەرچڵی ژینەکەم
وەرە سا بەعیشقی جەوانانی مەست
بەکوپەی شەرابی ترێ ی کۆن و خەست
بەتیشکی بەتین و بەتاوی هەتاو
بەزولفانی وەک سومبول و پرچی خاو
بەسۆزەی بەیان و بەعەتری گوڵان
بەناڵەی هوزارو سەدای بولبولان
دەمێ با بەشادی بژین پێکەوە
لەژێر سێبەری دار چنارێکەوە
لەنێو باخ و دەشتی بەهەشتی بەرین
بەجووت هەردوو سەرکەینەسەر یەک سەرین
دەمێ تاجی شادی لەسەر سەر بنێین
غەم و تاڵی دنیا لەدڵ دەربنێین
بنۆشین نیتر شەربەتی عیشق و حەز
وکو بولبول و گوڵ لەناو باخ و رەز
لەگوڵزاری رەنگینی رووت ئەی نیگار
گوڵی شادی بچنم هەزاران هەزار

کۆیە: ١٩٤٨

# پرچ و بسک

سەیری ئەم پرچ و بسکە
سومبلزاری خۆڕسکە
بۆنی وەک عەترو مسکە
کەبا دەیکا پەرێشان
بەسەر کولم و بەسەرشان
سەد دڵ دەکا پەریشان
لەرانەوەی بەم تەرزە
لەو جێگە جوان و بەرزە
عاشق دێنێتە لەرزە
نەرم و هەودا هەودایە
بەڕاستی و پێ دیعایە
وەک تەلی کاربایە
هەر بەم تەل و بەم داوە
تەیری دڵمی کێشاوە
دانەی عیشقی بی داوە

کۆیە: ١٩٤٨

## بەناز برنج تەترە دەكا *

سەیری دووبارە دولبەرم
بەناز برنج تەترە دەكا
لەمێلانەی سینەی گەرم
تەیری دڵم هەترە ئەكا
عەشقی دڵ و سەودای سەرم
لەسەر یەكتر قەترە ئەكا

* *

بەخەندە خانەكەی دڵم
خەراب و ماڵ وێران ئەكا
بەداوی پەرچەمی، مەلم
عەوقی تەوقی گران ئەكا
بەئارەزوو هەر بە زوڵم
گوڵم دڵم بریان ئەكا

* *

مناڵە دڵ، دێوانەیە
مەیلی گەمەی مەمەی ئەكا
سووتاوە دڵ، پەروانەیە
پەلەی شوعلەی گۆنەی ئەكا
بولبولی بێ هێلانەیە
ناڵین بۆ خونچەكەی ئەكا

* *

لەحەسرەت خونچەكەی دەمی
هوزاری زارو شین ئەكا
لەتاوی چینی پەرچەمی
دەمێكە دڵ گرین ئەكا
بەخەندەی بایی بێ خەمی
تاڵانی دڵ و دین ئەكا

* *

تیری نیگاهی چاوەكەی
لەجەرگ و سینەكار ئەكا
روومەتە نافتاوەكەی
هەزاران گەشكەدار ئەكا
نیجگار ئەگریجە خاوەكەی
دڵی دڵزاری زار ئەكا

كۆیە: ١٩٤٨

*تەترە: تەتەڵە.

## لەزستان بێزارم

دەبا بەفرو سەهۆڵ ول بێ
قەڵای زستانێ کاول بێ
نیتر با مەوسمی گوڵ بێ
لەمەرلا تیپی بولبول بێ
بەرامبەر گوڵ لەسەر چڵ بێ
خرۆش و جۆشی وەک دڵ بێ
سەدای ناوازو غول بێ
گوڵستان پڕ شل و مل بێ

* *

شل و مل پڕ گوڵستان بن
خەریکی گەشت و سەیران بن
لەژێر سایەی چناران بن
لەرۆخی جۆیە باران بن
گوڵاڵەی لالە زاران بن
شکۆفەی مێرغوزاران بن
لەرەنگی گوڵ هەناران بن
لەتوخمی چاوخوماران بن

* *

کراسی ناخو نۆف بدڕن
دەسی زۆرداری غەم ببڕن
گوڵی شادی دەبا بکڕن
بەنەرمی دەستی یەک بگرن
بگێڕن نەڵقەیی شایی
کچانی حۆری ناسایی
بەچاوان و بڕزەی بایی
بەتای زوڵفانی تاتایی
بکێشن نەهلی ناوایی
بنۆشن شەربەت و چایی

## یاری من

ئەی تاکە خونچەی گوڵی گوڵزاری من
یاری من
بۆ گوڵی روخسارو دەمت بولبولم
ئەی گوڵم
رەحمێ بەناڵەی دڵ و هاواری من
تینی تەنم تێ مەگە ئەغیارتم
یارتم
تاکە گوڵی سووری چڵی ژینمی
دینمی
عاشق و سەوداسەرو دڵزارتم
جاوەرە ئەی دیدە پەری ئاسکەکەم
ئاسکەکەم
تاوێ لەژێر سێبەری سێوو هەنار
ئەی نیگار
ئەختێ بەناز سەر کەرە سەر باسکەکەم

کۆیە: ١٩٤٨

## دروشمی خۆشەویستی

پەپولەم دەگرت، لەباخچەی گوڵان، دوێنێ دایە گیان
کەوا پێی گوتم: جوانی نازداری، بووکی کوردستان
گوڵاڵەی لێوت، هێندە شیرین و تەڕو پاراوە
هەنگی ئارەزوو پەپوولەی حەزمی تێ وروو کاوە
پێ ی گوتم: سنگی بێگەردو سافت کانی سامانە
جووتە مەمانی خڕو پڕچنگت، فینکی دڵانە
جوانم! ئای کەچەند، ئم واتە خۆشە دڵی بزواندم

خوێنی جامێلی هێنامە جۆش و رووی داگیرساندم
ئای دایە دەمی چەندە بەهێزو شیرین و گەرمە
لەماچ رفاندن چەندە چالاک و بێ ترس و شەرمە!
سەرم لە شەرمان داخست و دامام کەوتمە پێ خوستی
شەرمی ئافرەتان دیارە دروشمە بۆ خۆشەویستی!

هەولێر: ١٩٦١/١١/٢٤

## نیگارا

نیگارا قامەتی بەرزت چ شۆخ و شەنگ و باریکە
چرای رووت چەندە رووناک و شەوی زوڵفت چ تاریکە

## بۆ کەمانچەژەن و ژیان

هاورێم زاهیر هاوڕێی ژیان
ئەی بەهرەوەر وەستای کەمان
کاتێ کەخوای ئاگر: ڤولکان
ئاگری بەردا جەستەی ژیان
خوای شیعرو فەن، خوا ئەپۆلۆ
گریا وەک من، گریا وەک تۆ
کیوپید، ئەثینا، ڤینوس
هەڵیان رشت فرمێسک و ئەفسۆس
لەسەر لاشەی ساردو سڕی
یەخەی خۆیان زۆر دادڕی
گریان بۆ پەری شیرینی
خۆشەویستی و نازەنینی
گریان وەک ئاوازی کەمان
بۆ کەمانچەژەن و ژیان

کۆیە: ١٩٦٥/٣/٤

* بەبۆنەی ئاگرتێبەربوونی ژیانی هاوسەری مامۆستاو کەمانجەژەنی خۆشەویستەوە کاک (زاهیر محەمەد) گوتراوە.

## ئەفسانەی گوڵی شەرمن

دەڵێن کەخوڵقا گوڵ لە گوڵستان
سپی بوو سپی، وەک بەفری کوێستان
بەڵام لەودەمە، دەمی کردەوە
بۆ ماچ کردنی رووناکی بەیان
هەستی کرد ئادەم تەماشای ئەکا
بۆیە روخساری سووربوو لەشەرمان
راستی ئاوابوو سەر کولمی یارم
پێش هەڵمژینی بەر لەرامووسان!

## هەزار بریا *

هەزار بریا دەمی تێکرای
کچانی جوانی دنیایە
دەمێ بوایەو بە کامی دڵ
ئەمن ماچم بکردایە!

* ئەم بیرە هی (بایرۆن)ە.

دیمەشق: ١٩٨٩/١/١٤

## خۆرهەڵاتن

سپێدەی بەیان، لەئاسۆی خاوەر
پەردەی تاریکی دڕی سەرانسەر
شەفەقی سووری پێشەنگی خورشید
چەند جوان دەشوبهێ بەخوێنی شەهید
کچی رۆژگار، خۆری ورشەدار
پرشنگی گەییە بەندەن و بنار

## لەنێوانی لاو و کیژۆڵەیەکدا

لاوە:

کیژۆڵەکەی چاو مامزی
گۆنا گوڵی لێو قرمزی
تاوانبار و نێمان سزی
نافەتی دین و دڵ دزی

* *

دزی دڵ و دزی گیانی
دزی خەوی ناوچاوانی
نەک هەر دزی شای دزانی
سزاواری سزادانی

کیژۆڵە:

لاوەکەی شۆخ و شیرینم
هیوای ماڵ و مایەی ژینم
هەرتۆی بڕوام هەر تۆی دینم
تاوان لەخۆمدا نابینم

* *

تاوانباری راستەقینە
هەر چاوە، چاو هۆی بینینە
نەگینا دڵ لەناو سینە
چوزانی کام روو شیرینە؟

قەڵادزێ: ١٩٦٥/٢/٢٧

# کۆچی سوور

ئەی یارەکەم
نازدارەکەم
دۆستی دڵە غەمگینەکەم
نەخشینەکەم
لەتی گیانە شیرینەکەم

* *

کۆچی سوورت
بۆ هەرێمی تازەی دوورت
تاساندمی
بڕژاندمی
بەبێ ئاگر سوتاندمی

* *

فریشتەی هێمنایی و خەوی
لەناو گلێنەدا کوشتم
یادەی ڕشتم
یادەی شادی و بەختەوەریم
یادەی دڵداری و دڵتەریم

* *

ئەی یاری خۆم
سەوداسەری ئەڤینی تۆم
هەروەکو مۆم
دڵەی زارو داخورپاوم
داگیرساوە
فرمێسکی دووریت لەچاوم
قەتیس ماوە
شەو تا بەیان

لەتاوی تۆ لەناڵینم
نازەنینم
بێ تۆ جوانی ئەم دنیایە
بێ بەهایە
ئاسمانی شین
لووتکە شاخی بەرز و بەفرین
پەپوولەی نایاب و نەخشین
دەنگی هوزار
رەنگی کەژ و هەردە و نزار
بێ تۆ ئەی رۆحی رەوانم
بێ دەنگی تۆ
بێ رەنگی تۆ
بێ تۆ گیانە
کە وەک کۆتری خنجیلانە
دات لە شەقەی باڵ و فڕی
بەرە و هەوارگەی بێگانە
چەند سەد کیلۆمەترت بڕی

* *

دەڵێم جوانی سروشت گیانە
تۆزقاڵێ ئازاری گیانم
لانابا سووک ناکا بارم
لەبارێکی نالەبار
تانی زار و پۆی ئازارم
من دڵزارم
من دڵزارم

قەلادزێ: ٢٥/٣/١٩٦٥

# دینی خۆشەویستی

دڵم دیوانی دیدە مەستـانە
باغی بتخانەی بت پەرستانە
لەوحی تەورات و سەفحەی قورئانە
کەعبەی ئیسلام و شینگای ** جوانە
دێری رەبەن و مەکۆی موغانە
خۆشەویستێکی راستی ئینسانە
خۆشەویستی یە دینی من گیانە
بێ خۆشەویستی ژین کەی ژیانە ؟

کۆیە : ١٩٦٧/٢/١١

* بیرەکە لە شێخ (محی دینی) عەرەبییەوە وەرگێراوە .

** شینگای جوان : (مبكى اليهود) شوێنێکی پیرۆزی جولەکەکانە لە قودس .

## یادكردنەوە

بۆ كچە كڵاوچنێكی دەرگەڵەیی

* *

لە یادم دەرنەچووی دەرناچی هەرگیز
بەزستان و بەهار ، هاوین و پایز
لەبەر چاوی خەیاڵی من خەیاڵت
نمایانە وەكو جلوەی جەمالت
دوو زوڵف و دوو كەزی زێر باوی لوولت
دوو چاوی مەندی وەك دوو گۆمی قووڵت
گوڵی سەر كوڵم و لێوی تازە غونچەت
كڵاو و شیش و كۆكڵە * و دەست و پەنجەت
دەمی دانیشتنی نەودیوی تامان
كەجار جارە دەكەویە بەحری دامان
لەیادمدا دەژین و نامرن قەت
ئەمانە یادگارێكن بە قیمەت!

* كۆكڵە: گڵۆڵەی خەیاتەیە كە كڵاوی لێ ئەچنن

كۆیە: ١٩٦٧/١٠/٩

## سوێند

سوێندم بەچاوی مامزیت،
بەهەردوو لێوی قرمزیت،
دڵێكم بوو ئەتۆ دزیت!

## لەخەوهەستانی کچێک •

لەگەڵ پێشەنگی تیشکی تازەدا لەتوێی نوێنا
کچە جوانەکە تەنیشتی گۆڕی، چاوی هەڵێنا

گوڵ خونچەیەکە، تا ئێستا دەمی بۆ ڕۆژی دەم کەڵ:
نەکردۆتەوە، لەسێبەرایە، چاوەڕێ ی ئەمەل

قوولایی ئاخی سوسنی نەشکوفتە، ئاخۆ شایانە
بۆ پیاو بۆنی کا، مادامکی هێشتا لەڕۆژ پەنهانە؟

ژن لەکاتێکا تازە خونچەیە، سەرچاوەی سۆزە
پەرستگایەکە، تا بیرمان بڕکا، پاکو پیرۆزە

نازانم بۆچی کچی کوردستان، هێندە شەرمنە
لەگەڵ دەرکەوتن، شان و مل رووتی، ئاوا دوژمنە

پێ ی سپی بۆچی وا خۆی دەکوتێتە ئەسکارپینەوە
سنگی هەڵزەقیو، لەژێر کراسی ئاورشمینەوە

بۆچی وا خێرا خۆی حەشار دەدا لەڕووی ئاوێنەش
هەروەک ئاوێنە تەماشای بکا بەدووچاوی گەش؟!

کەمترین چپە، سووکترین جوولە ڕای دەچڵەکێنێ
تەماشاکردن رووخساری سووری، دادەگیرسێنێ!

بەرامبەر لەخەوهەستانی کچێک، ئەوەی کەپیاو بێ
دەبێ لەشەرمی جوانی ئەو کچە، چاو داخراوبێ!

※ نامەیەکی دلدارى ڤیکتۆر و هۆگۆ بۆتە مایەی ئیلهامی ئەم پارچە شیعرە

کۆیە: ١٩٦٧/١٢/٧

# جوانی ئافرەت

رۆژێ من و یار
رۆژێکی بەهار
بۆ گەشت و گوزار
بۆ بینینی گوڵ
ئەمڕوانی جارجار
کەچی گوڵبەهار
شۆخی شل و مل
کەناسکتر بوو
سەرگۆنای لەگوڵ
گوتی: شەرمت بێ
دڵی نەرمت بێ
لەباتی رووی من
لەباتی مووی من
سەیری گوڵ ئەکەی؟
هی سومبل ئەکەی؟
کەینێ گوڵ گەشە
وەک گۆنای گەشم
سومبل بۆن خۆشە
وەک زوڵفی رەشم؟!
کەینێ وەنەوشە
وەک خاڵی لێوم
شیرینە یاسێو
وەک شەکرەسێوم؟!

کەی لالە ئاڵە
وەک لێوی ئاڵم؟!
نێرگز کەژاڵە
وەک چاوی کاڵم؟!
توخوا گوڵزارو
سروشت بەگشتی
جوانی لەوردی
هەتا درشتی
دەگا بەجوانی
شۆخی بالابەرز
کەجیلوەی نازی
دڵ دێنێتە لەرز؟!
کام ئاواز کام ساز
لەرەو لەرزینی
سحراوی ترە
لەپێکەنینی؟!

## خەیاڵ

خـەیاڵ عــەردێکە، تا حــەزکــەی بەپێــز
شـیـعـرو پـەخـشــان و بیـری زۆر بەهـێـز

لـەناخـی دڵیــــا خــــێـــــرا دەڕوێـنـێ
مـێـشـک و عــاتیـفــەو قـەڵەم دەدوێنێ

خــــەیاڵ کـــوفــــارەی بەرزی هـونەرە
بەهرەی تایبــەتی عــەقــڵی بەشـــەرە

بەڵام بریقــەی خـورشــیـدی خـەیاڵ
لـەتۆی هـەورا بێ یالـەنێـو ســامــاڵ

کـــزە پرشنگی ســـــتـــە پرتەوی
گـــــەر نزیک نەبێ لـەتـۆپی زەوی!

مۆسکۆ ١٩٧١/٢/٢٢

## گوڵبەهار

هێــزی دڵ نارامی گـیــانم گــوڵبـــەهار
شـــاگـــوڵی باخی ژیانم گـــوڵبـــەهار

ســـحــری رووت و کــانی جـــوانی وێنەتە
گـــــەردنی بێ گـــــەردی وەک ئاوێنـەتە

چاوی تۆ نەی نووری چاوم چەند گــــەشن
چەندە جوان و چەندە ساف و چەند رەشن!

کوڵمی سوورت وەک گوڵاڵەو شەست پەڕە
لێـــــوی ئاڵت گـــــەرم و پاراو و تەڕە!

دەنگی تۆ ئاوازی شـــــمـــشــــاڵ و نەیە
رەنگی گـــۆناو گـــەردنت ســـێــو و بەیە

هەنگی رۆحی من لەســـەر خـــونچەی دەمت
نافـــڕێ هەرگـــیـــز بەزوڵف و پەرچەمت

مـــــن دەزانم چـــۆن دڵـــی تـــۆ لـــێ دەدا
مـــــن دەزانم ئـــــارەزووی تـــــۆ رێ دەدا

ئەم دڵەی پڕ شـــــــــۆرو پڕ هاواری مـــن
ئەم تـەنـەی بـێ تـین و پـڕ ئـازاری مــن

راکـــشێ تاوێ لەســـەر ســـینەی نەرم
خـــۆ فـەرامـــۆش کـــا لەناو کـــۆشی گـــەرم.

مۆسکۆ: بەهاری ١٩٧٨

# شەو و هەستی من

مـــانگی گـــولانە شـــەوە ئاســـمـــان
ســافـە سـامـاڵە، پڕ ئەسـتـێـرەی جـوان

شـــــەو ڕاشـکـاوە دەمـــــــەو بەیـانە
مـانگ لـەودیوی کـەل، نوقـمـە، پەنهـانە

پڕچی ڕەشـی شـــەو، شــەونم دەتکێنێ
کــــــــزەی بـەربـەیـان ژیـان دەپـژێـنـێ

شـــــــەو بـە هـەزاران هـەزاران چـاوی
نزیک و دووری گـــەش و ســـحـــراوی

هـەرتێـم دەڕوانی و هـەرلـێ ی تێـــرنابم
لـێـی وردبـەوەو چـی لـێ فــــێـــرنابم

جــوانی و گــەورەیی و ســۆزیکی بەهێــز
دڵم دادەگـــرێ و دەمـکـاتـە ئـامــێـــز!

: شەوێکی نیسانی ١٩٧٢

## ساتێ بەختیاری

چەن جوانە سێبەری راکشاوی چنار
لەسەر فەرشی چیمەنی رۆخی جۆیەبار

چەن جوانە چ شیرینە، چەندە دڵگیرە
ئەو تاڤگە پاکەی کە دەڵێ ی چۆڕی شیرە!

لەم خاکە پاکە خۆشە بێ خەوشە شیرین
بێ: دووبەدوو کەمێ دوور لەغەم دانیشین

بانوقمی دەریای قووڵی دڵداری بین
ساتێ خاوەنی تەختی بەختیاری بین

با لێ گەڕێین ئاوازی شمشاڵی شوان
لەدوورەوە بێت و بدا لە گوێچکەمان

بابێ دەم بەدەم بێ لەگەڵ شنەی شەماڵ
عەتری گوڵانی کێویلکەی دۆڵ و دەم یاڵ

ئای چ ئیلهامدەرێکە کانیاوی زیوین
پەڵە هەورە سپی یەکانی بۆشایی شین

هەرچی لە دەوروپشتمانەو کە دەیبینین
جوانە وەک کچی جوانی دەم بە پێکەنین!

کۆیە: ١٩٥٧

## گەردانەی پەریخان!

لەشەوغی بەربەیان
لەئەستێرەی گەش و جوان

لەمرواری و لەمەرجان
بۆ گەردنی پەریخان

ئەهۆنمەوە جوانترین
گەردانەی عیشق و ئەڤین

*

گەردانەیەک کەسەنگی
هێژاتر بێ لەڕەنگی

لەنایابی و قەشەنگی
چ کەس نەگاتە چەنگی

ورشەی وەک رۆژی رووت بێ
بەڕاستی سیحری رووت بێ!

## ئافرەت و جگەرە

راستە ئافرەت و جگەرە هەردوو
سنگی پیاودەکەن، شەکەت و ماندوو
بەڵام پیاو توتن دادەگیرسێنێ
ئافرەت بێ پەروا پیاو دەسووتێنێ

دەرگەلە: ١٩٧٣/٥/٨

# سرووشی سروشت

سرووشی سروشت هاویشتیە بەرگوێم
هەندێ لەجوانی کوردستان بدوێم

بیخەمە بەرچاو نەیار و یاران
دیمەنی جوانی گوڕەی بەهاران

کاتێ کەهەردەو چیاو چۆڵ و دەشت
نیگارین ئەبن بەگوڵ وەک بەهەشت

ئاوی قەڵبەز و کانی و سەرچاوە
تاڤگەو سولاوی بەفری تاواوە

بەقەد کێوەکان ئەم دیو و ئەودیو
ئەڕژێنە خوارێ چەشنی ئاوی زیو!

کەتیشکی خوری لەدوور لێ ئەدا
پتر رەونەق و شوعلەی پی ئەدا

داری چنار و گوێز و سپیندار
خۆخ و هەڵوژەو هەنجیرو هەنار

بەرگی ئایابی بەهار ئەپۆشن
ئاوی کەوسەر و ژیان ئەنۆشن

کۆیە: ١٩٤٦

# جوانە کوردستان

جوانە کوردستان خاکی رەنگینت
باغ و بەهەشتی پان و بەرینت
کێوانی بەرزی لووتکە بەفرینت
هەوای بێ گەرد و ئاسمانی شینت
کانی و سەرچاوەی ئاوی چەمینت
زێوەو بێخاڵ و دێ ی نازەنینت

* *

کەروێشک و کێوی کێوی کوێستانت
ئاسکی نەرمان و هەردەو وەردانت
باران و تەرزەو بەفری زستانت
وەرزی خەزانی گەڵاڕێزانت
گوڵ و هەڵاڵەو سوسن و رەیحانت
لاوی سۆران و کیژی بۆتانت

* *

ئەمانە جوانن گشتی دڵگیرن
هەوێنی هۆش و دەماغ و بیرن
بەڵام زۆر ئەفسوس ئەهلی ئەسیرن
بەتۆقی مەینەت بەندو زنجیرن
لەسەر ئەم موڵکەش رووت و فەقیرن
گیرۆدەی دەستی زۆردارو میرن

کۆیە: ١٩٤٦

## گوێ گرتن

سرپەی دوان و ترپەی پێت
لەهەر کوێ
نەگەربێ
هۆش و لەش و گیانم لێت
جێ بەجێ
بۆتە گوێ

## بەڕێ کردنی خۆشەویستێک

بەڕێ ی کردم و فرمیسکی گەرمی
خڕخڕ دەڕژایە سەر کوڵمی ناسک
گرتمیە باوەش بەهەردوو باسک
سنگی توندکردم لەسنگی نەرمی

❊ ❊

لێوی هەڵمژیم نارامی گیانم،
چرپانی بە گوێم، بەدەم ئاهو وای
بریا نەمدیبای هەر نەمناسیبای
ئای کەچەند سەختە بێ تۆ ژیانم

شەوێکی ئابی ١٩٥٤

## ژن

هۆی کلۆڵی و کامەرانی زۆرەها کەس هەر ژنە،
گەنترین مایەی ژیان و چاترین گەوهەر ژنە!

## چاوی تۆ....

چاوی تۆ چاوی شـــــەهێن یا چاوی بازو ناسکە؟
کولم و لێوت شەکرو گوڵ یا شەکرەسێوی ناسکە؟
سنگی نەرم و نۆلی گەرمت کێ هەیە وەسـفی بکا
مـــەمکی پڕ چنگت وە یا ئەم بەژن و باڵاو باسکە؟
هەر کەسێ سەوداسەری تۆ بێ وەکو قەیسی هەژار
شـێـتـە تا ڕۆژی قیـامـەت وێڵی هەردو باسکە!!

## جوانترین کچ

بەقـــا ناکـــەم لەدنیـــادا چ دایک،
لەتۆی جوانتر هەتا ئیستاکە بووبێ!
سەراسیمەن پەری، حۆری، مەلائیک
کەریشەی تۆش لەتۆی ئەم خاکە بووبێ!

## تۆ .....

تۆ کـــەنازدارو باڵا عـــەرعـــەری *
تۆ کـــەچاوجـــوان و نیگا خـــەنجـــەری
زولف مـــووشکین و پەرچەم عـــەنبـــەری
تازە پێم دەڵێ ی شـــەیدای کـــام پەری؟

* مەبەستم عەرعەری کێوی یە (هیشرست).

## هەرمێ خۆشە!

لەباخـــێکا لەیارم پرسی: نەرمێ
چ خۆشە؟ پێ ی گوتم هەنجیر و هەرمێ
گـــوتم: لای من ئەوەی ڕۆحی ژیانە
بەچاوی تۆ قـەســەم هەر مێ یە هەرمێ!

مارەدوو ١٩٦٦

## حوكمی ناڕەوا

حوكمی تۆ ئەی گیان و دڵ دەردو دەوا
ناڕەوایە ناڕەوایە ناڕەوا
نەخشی دڵمە پەیكەری پاكت كەوا
ناڕوا قەت ناڕوا قەت ناڕوا

## دڵداران دەوڵەمەندن

دەوڵەمەندن ئەو هەژارانەی كەوا
خۆشەویستی راستی ئاڵوگۆڕەكەن
تەرمی خەمباری لەژێر باڵی شەوا
زۆر بەشادی كفن و دفنی گۆڕەكەن!

## شۆخی جوان...

شۆخی جوانی بەدرەوشت
وەك ژاڵە ناڵە تاڵە
بەڵام یاری خۆش سروشت
كانگەی كەماڵە ماڵە

## بەحری دڵداری دەرگەڵە

بەحری دڵداری دەرگەڵە،
بەکێ نادا مەیلی مەلە؟

چەم و شاخ و باخ و رەزی،
بەهەشتی کیژو کوڕگەلە.

بۆ هەر لا هەر شوێنێ دەچی،
هەر سیم و تەلسیم و تەلە!

چەشە زۆرەو زۆریش برسی
چۆن دەربازدەبی لەتەڵە؟

رەهابوونت نیەو نابێ
هەزار پەل بکوتی بەپەلە!

خەرمان کەزۆرو زەبەند بی
بۆچی بێ بەش بی لەخەلە؟

گەوجە هەرکەس بەخۆڕایی
لەدەستی خۆیدا ئەم هەلە!

دەرگەڵە: رۆژێکی هاوینی ١٩٦٦

## بەیان بوو ...

بەیان بوو، چوومە ناو گولشەن لەبۆ گەردوش لەنێو گولدا
چ گولشەن؟ گولشەنی جەننەت، چ جەننەت؟ (جەننەتو المأوی)

بەقەترە وەستابوو لەسەر بەرگی گولان شەونم
چ شەونم؟ شەونمی لوء لوء، چ لوء لوء؟ لوءلوء ی لالا

بەنەغمەی خۆشی پڕ جۆش و خرۆش دەبغی دەماغم کرد
چ نەغمە؟ نەغمەیی بولبول، چ بولبول؟ بولبولی شەیدا

بەبۆن و نکهەتی عەتری گولان سەرخۆش و مەدهۆش بووم
چ نکهەت؟ نکهەتی نێرگز، چ نێرگز؟ نێرگزی شەهلا

کەسەیرانگای نیگارانی بەبێ هاو، شکل و صورەت بوو
چ صورەت؟ صورەتی حۆری، چ حۆری؟ حۆریی حەوڕا

سەراسەر باغ و گولزاری بەهەشتی پڕ لە دیمەن بوو
چ دیمەن؟ دیمەنی چیمەن، چ چیمەن؟ چیمەنی مینا

نیتر دلزار سەری سوڕمابوو خۆ لەم صنعەت و نەخشە
چ صنعەت؟ صنعەتی حکمەت، چ حکمەت؟ حکمەتی یەکتا!

کۆیە: ١٩٤٦

## گوڵ

نۆبەرەی وەرزی بەهارو بووکی گولزارانە گول
رەمزی جوانی یاری شۆخ و شەنگ و دلدارانە گول

# نەورۆز نامە

مــــژدەبێ ئەی کـــورد کـــەئەمـــڕۆ جـــەژنەکـــەی ئەورۆزتە
کـــاتی خـــۆش بەخـــتی و ســـرورو ســـاتەکـــەی پیـــرۆزتە
وەخـــتی شـــادی و غـــەش لـە دڵ دەرکـــردنی گـــشـت هۆزتە
مــژدەبێ ئەی کـورد کـەنەورۆز پێـشــڕەوی ســەربەســتی یە
مـــــــژدەهـێـنـی ڕۆژی ئـازادی لـەدیـلـی و پـەســـــــتی یە

※ ※

دەشـت و دەر خـەمـڵـیـوە ئەمـڕۆ هەروەکـو باخی بەهەشـت
گەنجو پیـر شـادانە سـەرمـەستن بەنەشـئەی گەشـتی دەشـت
وەک مـــرۆ هـاوارەکـا ســـروەی شـــەمـــاڵ و بایی وەشـت
مــژدەبێ ئەی کـورد کـەنەورۆز پێـشــڕەوی ســەربەســتی یە
مـــــــژدەهـێـنـی ڕۆژی ئـازادی لـەدیـلـی و پـەســـــــتی یە

※ ※

ســـەیری ئەم باغـی بەهەشـــتی خـــاکی کـــوردســـتـانە کـەن
ســـەیری ئەم بەرق و بریـقـــەی گـــوڵ و ســـەیلاوانەکـــەن
ســـەیری مـــەی صـــافی نمی ناو پێکی ئەم خـــونچـــانەکـــەن
مــژدەبێ ئەی کـورد کـە نەورۆز پێـشــڕەوی ســەربەســتی یە
مـــــــژدەهـێـنـی ڕۆژی ئـازادی لـەدیـلـی و پـەســـــــتی یە

※ ※

ڕەندووە بەفـــری مـــێـــزەری کـــێـــوان و تەم تاوانە
وشـکەشـــیـــو و چۆم و چەشـــمـــەو گـــیـــاو گـــوڵ بووژانەوە
هـــەردو وەردو دۆڵ و گـــــــــــــــــردو رازو ڕەز رازانـــەوە
مــژدەبێ ئەی کـورد کـە نەورۆز پێـشــڕەوی ســەربەســتی یە
مـــــــژدەهـێـنـی ڕۆژی ئـازادی لـەدیـلـی و پـەســـــــتی یە

※ ※

سەیری قاڵی سەوزی ئەم دەشتانەکەن چۆن گوڵ گوڵە
سەیری شایی شەنگەبیی شەنگی بەریشەوەمو پلپلە
گشت چەمەن ئەمڕۆ لەرەقسایەو غەزەل خوان بولبولە
مژدەبێ ئەی کورد کەنەورۆز پێشڕەوی سەربەستی یە
مژدەهێنی ڕۆژی ئازادی لەدیلی و پەستی یە

* *

قەومی کورد ترست نەبێ هەرگیز بەقەد نووکی زەڵێ
جەژنی نەورۆزیش وەکو دڵزار بەئاشکرا دەڵێ
قەومی کورد زۆری نەماوە ڕۆژی ئازادی هەڵێ
مژدەبێ ئەی کورد کە نەورۆز پێشڕەوی سەربەستی یە
مژدەهێنی ڕۆژی ئازادی لەدیلی و پەستی یە

بۆ نەورۆزی ١٩٤٦ لەکۆیە

## هەژاری و دڵداری

نازانی چۆنە دەردی هەژاری
کەسێ بێ کەس و هەژار نەبوو بێ
گەوجە لەئاستی ڕاستی دڵداری
ئەوەی لەشەڕیا زامار نەبوو بێ

کۆیە : ١٩٦٧/١١/٢٥

# تیٚکڕای شیعرەکانی دی

ئەو شیعرانەن کەبەر سووتان و لەناوبردن نەکەوتون و ئەوانەش کەدوای کۆدەتایەکەی شوباتی ١٩٦٣ بەبۆنەی جیاجیا گوتراون.

# گەنجێ

گـەنجێ کـەپیـــشـەی هـەر فـــەســـادی بێ
دایم قـــــومـــــارچی ژووری نادی بێ
مـــەیو مـــەیخـــانەو هۆش و یادی بێ
مــــەینـەتی کـــوردی لـەلاشـــادی بێ
خـــوایـە بەشی ئـەو هـەر کـــەســـادی بێ
** **

کـوردێ کـەئاشـــقی کـوردســـتـان نـەبێ
خـــزمـــەتگوزاری نیـــشـــتـمـــان نەبێ
بـــاکـی بـــەنـــاڵـــەی هـــەژاران نـــەبـــێ
دڵتـــــەنگی جـــــەوری دوژمـنـان نـەبێ
خـــوایـە بەشی ئـەو هـەر کـــەســـادی بێ
** **

مـــەزنێ کـەنیـــشی کـوردی بەدەست بێ
لەگـەڵ هاوقـــومی رووگـرژو پەست بێ
لەراست مـەزڵوومی گەلی بێ هەست بێ
دایم مـێبـازو سـەرخۆش و مـەست بێ
خـــوایـە بەشی ئـەو هـەر کـــەســـادی بێ
** **

ئـەوەی بۆ وەتـەن گـــیـــانفـــدا نەبێ
لـــەرێ ی ئـــازادی بـــێ پـــەروا نـــەبـــێ
لەگـــشـت فـــرمـــانێ بێ هاوتا نەبێ
غــــیــــرەتی کــــوردی لـەدڵدا نـەبێ
خـــوایـە بەشی ئـەو هـەر کـــەســـادی بێ
** **

ئـەوەی غـــــەمـــــزەدە وەک دڵـزار نـەبێ
بەجـــەوری دوژمـن گـــرفـــتـــار نەبێ
مـــات و غـــەمـنـاکی کــوردەوار نـەبێ
لـەهەسـتی مـیللی کـەبەشـدار نەبێ
خـــوایـە بەشی ئـەو هـەر کـــەســـادی بێ
** **

یەکێکە لەگۆرانی یەکانی تایەر تۆفیق

کۆیە:١٩٤١

## نامەیەک بۆ وردی

برای هاوبیرو هاوخاک و زمانم
گوڵی باخی بەهاری نیشتمانم

نومێدی پاشەڕۆژی قەومی کوردم
خودانی ژیر و بیرو شیعری وردم!

ژیانت باش، شەوت باش، کاکە رۆژباش
ملی نەغیاری قەومت بێتەخاش خاش

لەبۆ لاو پێگەیاندن، تێگەیاندن
لەبۆ شتڵی وەفاداری چەقاندن

لەبۆ لابردنی پەردەی خورافات
لەبۆ سەرکەوتنی سەر کێوی ئاوات

بژی هەردەم بەخۆشی و کامەرانی
شەوانت جەژنە بن جەژنیش لەبانی

خودایە قەت غەم و حەسرەت نەکێشی
چ ئەندامی لەشت هەرگیز نەئێشی

نیتر تۆ وردی ئەی وردی بە وردەی
لەبۆ کوردی بەکورتی زۆر بەکردەی

نومێدی وایە سا (دلزار) کەباری
لەملمان دارنێ تەوقی هەژاری!

* ئەوسا لەمەهاباد بوو، بەر لە پێکهاتنی کۆماری دیموکراتی کوردستان چووبوو.

حەبانیە:١٩٤٥

## پارە

لای کەسانی پارەپەرست
یا ئینسانی زیللەت نوشوست
پارە مەتاو ماکی ژینە
شەرەف، نامووس، غیرەت، دینە
زمان، سلاح، پیاوکوژ، هێزە
بەرزی، ئاوات، حورمەت، رێزە
دایک، باوک، خوشک، برایە
ئاپۆ، خاڵۆ، پوور، خوارزایە!

١٩٤٥

## بۆ رەسوولی حەمەدەمینی کەبابچی

کەبابت بوو کەبابت بوو
کەبابت چوو کەبابت چوو!

## کارەبای کۆیێ

نۆزدەی ئیکی پەنجاو دووی پاش،
هەزارو نۆسەد بوو، کەوا،
رەهابوو کۆیێ دەرچوو باش،
لەژێر پەنجەی رەشی شەوا.
وەک کۆمەڵێ زوخاڵێ زل،
بەبێ ئاگر بێ رەشەبا،
گەشایەوەو بوو بەسکڵ،
کۆیە بەتیشکی کارەبا!

## پێش هاتن و دوای چوونت!

پێش ئەوەی تۆ بێیتە دنیا هیچ نەبووی،
ئەی کەکۆچت کرد لەدنیا نەبیە چی؟
بێ کەمێ ئاگا لەتاریکی ئەزەل
هاتیە رووناکی کەبۆ تاری ئەچی!!

## بەمن چی!

بە من چی خاکی کوردستان بەهەشتە
هەمووی گوڵزارو باخ و کێو و دەشتە

چ سوودێکی هەیە خێرات و خەرمان
ئەگەر رۆژێ دەیان بمرن لەبرسان

چریکەی بولبولی سەرچڵ چ دێنێ
ئەگەر دڵ دەردی بێ نانی هەڵێنێ

کەژی قەندیل و هەورامان و هەڵکورد
کەبەرزن، ئاخۆ بەرزە حاڵەتی کورد؟

وەکو کوێستانەکان بێ تۆزو گەردن
هەژارانیش وەها بێ ئەرک و دەردن؟

وەکو ئەم خاکە پاک و سەوزە پۆشە
دڵی دانیشتووان وا ساف و خۆشە؟

بەڕاستی وەسفی خاک و دیمەن و دار
نەبەد ناکا برینی نێمە تیمار

دەبێ زۆر چاک بزانین بۆ هەژارین
لەناو قەومانی عالەم نادیارین

چ میکرۆبێکە واکەوتۆتە دڵمان
چ تەوقێکە کەعەوقاوە لەملمان!

چ وەحشێکی درە خوێنمان دەڕێژێ
چ زۆردارێکە سا حەقمان دەنێژێ!

دەبێ زۆرچاک بزانین کێ یە زۆردار
بزانین کێیە نیستعماری خوێنخوار!

چلۆن گملان بەکاردێنێ وەکو هەنگ
بەری ڕەنجمان دەبا دوایی بە بێ دەنگ!

وڵاتمان کانی زێڕو زیو و نەوتە
کەچی بەشمان کەڵاش و جاو و جەوتە!

کەزانیمان چیە میکرۆبی عیللەت
لەناوجەرگ و هەناوو گیانی میللەت

دەبێ هەوڵێ بدەین تاکو دەری کەین
بەدەرمان و دەوای یەکبوون پەکی خەین!

کۆیە: ١٩٤٨

## گۆرانی
## (مانگی نیسان)

دیســــان مــــانگی نیـــســـانە
گـــــەرمــــــەی وەرزی گــــولآنە
کـــاتی شـــایی و ســـــەیرانە
رۆژی جـــــەژنی عــــاشــــقـــانە
هـەســـتـــە گـــیــــانەکــــەم ......

* *

گـــولّشـــــەن ســــەراپا گـــولّە
بـەجـــــارێ پڕبـولـبـــــولـە
لـەژێـر ســــــایـەی هـەرچـڵــــــە
جـــــــــووتێ یـاری هـاودڵـە
هـەســـتـــە گـــیــــانەکــــەم ......

* *

ئێــــــمــــــەش هـاوتـای دڵداران
بـاروبـکـەیـنـە گـــــــــولـزاران
لـــەژێـــر ســــــــــایـەی چـنـاران
گـــفـت و گـــۆکـــەیـن وەک جـــاران
هـەســـتـــە گـــیــــانەکــــەم ......

* *

باروکـــــەیـنە قــــەد گـــــردێ
لــــــەپــــاڵ تــــاوێـــــرە بـــــەردێ
دەس لـەگـــــەردن کــــەیـن کـــــەدەر
لـەدڵ نـەهـێـــــــڵین گـــــــەردێ
هـەســـتـــە گـــیــــانەکــــەم ......

* *

بالەناو باخی گوڵان
لەژێر سێبەری چڵان
لەسەر مێرغوزاری جوان
راکێشین تاوێ شادمان
هەستە گیانەکەم ......

* *

سەرینمان چەپکە گوڵ بێ
سەرپۆشمان سایەی چڵ بێ
غەزەل خوانمان بولبول بێ
ئاگرمان کڵپەی دڵ بێ
هەستە گیانەکەم ......

* *

شەرابمان شەهدی دەم بێ
مەزەمان ماچ و مەم بێ
هاوپێکمان پاکی چەم بێ
دڵمان خاڵی لەغەم بێ!
هەستە گیانەکەم ......

* *

بەدرێژی فەسڵی بەهار
ئەمەیە بیری دڵزار
گەرلێ گەڕێ ستەمکار
بژین شادو بەختیار
هەستە گیانەکەم ......

* *

* ئەمە یەک لەگۆرانییەکانی رەسوول گەردی یە.

کۆیە:١٩٤٨

## سەربەستی

یاران سەربەستی داری گوڵێکە
لەگوڵزاری ژین بەخوێن رواوە
کەبەختیاری خونچەی چڵێکە
لەسەر ئەم دارە پشکۆژەی داوە!

کۆیە: ١٩٤٨

## سروودی براگەل بخوێنن

براگەل بخوێنن توانا دەبن
خەبەرداری ئەحوالی دنیا دەبن
لەپێش لەشکری جەهل و زوڵم و زیان
بەوێنەی کەژو کێوو دەریا دەبن

* *

لەبەر جەهل و بێ علمی یە ئەم گەلە
لەقەومان بەجێماوە سست و شەلە
لەبۆ رەنجەڕ و خوێنمژی جەرگی خۆی
بەبێ شەرم و شۆ بۆتە کۆیلەو لەلە

* *

عیلم قەسری خوێنمژ سەرەوبن دەکا
عیلم کێوی فاشیستیەت کون دەکا!
عیلم داب و دەزگای نوێ دەردەخا
عیلم داب و دەستووری کۆن ون دەکا

* *

ئیتر هیمەتێ دڵ بەنازارە گەل
هەژارو وڕو دەم بەهاوارە گەل
بەزانین نەجاتی بدەن لاوەکان،
لەژێر دەستی خوێنرێژی زۆردارە گەل

کۆیە: ١٩٤٦

## ئەمە دوو بەیتە بەبۆنەی دووەم شەڕی جیهانییەوە گوتراوە

بۆچی ئەمڕۆ ئەی زەمان زیللەت زەمینی پۆشییە؟
چوک و مەزنی خەڵکی پاکی بەرگی شینی پۆشییە؟
بۆچی ئەم مەخلوقە بۆ خوێن ڕشتنی یەکتر وەکو
ئاگرو پوشن دوکەڵی وا غەرب و چینی پۆشییە؟

ساڵی ١٩٤١

## شیعر

شیعر پێویستە ئاوێنەی دەروون بێ
لەناپوختی بەدوور و پاک و روون بێ
بەرامبەر لەشکری دوژمن قشوون بێ
وەکو ئاڵا لەبۆ هەق هەڵکرابێ
لەگشت لایەکەوە پاڵپشت درابێ

* *

ئەبێ پڕ بێژو پەندو بێ زیان بێ
شەپۆلی وەزنی مۆسیقای گیان بێ
پەیامی پاک و پڕ نرخی ژیان بێ
لەکانگەی پاک و پوختی دەرکرابێ
بەناوی باشترین خوو ناو درابێ

* *

ئەبێ کانی شیعر هەردەم شعووربێ
کەهەر بەندێکی وەک چەپکێ چنوور بێ
لەگەچلانی دەسی دوژمن بەدووربێ
ئەوەک بۆ کەڵکی خوێنمژ رێک خرابێ
درۆی زۆرو دیعایەی تێ کرابێ!

* *

شیعر پێویستە سەهل و بێ گرێ بێ
هەمیشە تام و بۆی نادابی لێ بێ
لەسەر رێبازی ژین فانۆسی رێ بێ
لەبیری نەوتی زانین پرکرابێ
لەپرشنگی بەوێنەی شەوچرابێ!

* *

ئەبێ شاعیر کەم و کورتی بەدەرخا
دەوا نیشان بدا هەرچۆنێ چەرخا
رەنی رۆشن بەدەرخا چۆنی سەرخا
حقوق زانێکی پسپۆڕی وەهابێ
لەگشت کارێکی میللەت شارەزابێ

کۆیە: ١٩٤٧

## جەژنی نەورۆزە

زەمین گوڵزارە تازە بەهارە
جەژنی نەورۆزە
هەوا عەترینە مێرغوزار شینە
چەشنی پیرۆزە
بەسروەی بەیان شۆڕابەی بیان
پەرت و ناڵۆزە
ناڵینی بولبول لەسەر چڵی گوڵ
بەتاو و سۆزە
کچی نەوبەهار نەورۆزی نازدار
هێند جوان و قۆزە
مایەی حەیاتە جوانی نەداتە
خاکی ئەم هۆزە

کۆیە: ١٩٤٨

## سروودی یەکێتی و زانست

هێــــزی یەکــێــتی و چرای زانســـــتی
کـــورد رزگـــارەکـــا لەژینی پەســـــتی
خـــوێندنە خــوێنی دڵی مـــیـللـەتان
زانیــنە دەوای دەردو عــــــیـلـلـەتان
مـــیـللـەتی نەزان ســـووک و ریســـوایە
گـــــەنجی بۆ خــــەڵکەو رەنجی بەبایە
بخـــوێنە ئەی کـــورد، چونکە بەخــوێندن
تـــۆ رزگـــــــارەبی لـەچـنـگی دوژمـــن
چەند هـەزار ســــاڵە بەندەو هـەژاری
چونکـە نـەزان و نـەخـــــوێـندەواری
هـێـــــزی تاریکی جـــــەهـل و بێ دادی
لـەپێش لـەشکری عـــــیـلم و ئازادی
ئـەگــــەر زەمین و زەریـاش داگـــــرێ
بێ شـک شـکاوەو هیچ خـــۆی ناگـــرێ
ئیـــتـر بخـــوێنە چەرخی بیـســـتـەمـە
دنیـــا رووناکـــەو کـــوردســـتـــان تەمـــە!

* ئەمە سروود بوو لەقوتابخانەکان دا

کۆیە: ١٩٤٦

# نامەیەک بۆ دڵدار

لەبارەی ئەمەوە کە (دڵدار) شەش سەدو سی و شەش فلس، قەرزاری کتێبخانەکانمان بوو، (کتێبخانەی کۆیسنجق) لەکۆیە، لەرۆژی ١٩٤٨/٩/١٢، واتا بەر لەکۆچکردنی یەکجاری بەشەست و یەک رۆژ، نامەیەکی زۆر جوانم بۆ نووسی و بەم چوار شیعرە کۆتاییم پێ هێنا:

برام کاک دڵدار، برام کاک دڵدار
نەدیبی گەورەو شاعیری قەرزار
شەش سەدو سی و شەش پوولّ قەرزاری
خێرا بینێرە بۆ لای دڵزاری
ئومێدەوارم ئەی کاکی شاعیر
محامی بەرز و بەرێز و ماهیر
لەخرینگ و هورو زرنگەی فلووس
هەرگیز نەمانکەی بێ بەش و مەنیووس!

کتێبخانەی کۆیسنجق: ١٩٤٨/٩/١٢

دڵزار

## وەرامەکەی

هەر لەهەمان رۆژدا دەمەو ئێوارەبوو، سمکۆی جوانمەرگی کوڕی ئاسەفی برای دڵدار، هات و ئەم نامە شیعری یەی دایە دەستم:

دڵزار شیعرەکەت، دڵزار شیعرەکەت
دڵزار نامەکەی پڕ شعورەکەت
گەیشتە دەستم لەوەختێکی وا
کافر بەحاڵم نەبیتن خوا
ئەڵێ ی شەش سەدو کسور قەرزاری
ئایا بۆ پارە زۆر گیانەهاری؟
زرنگ و هۆڕی درهەم و پارە
بۆ من خەیاڵی خەونی بەهارە
درهەم بزانێ لەجێ ێ من هەم
بەگوڕ رائەکا لەم چەم بۆ ئەو چەم
من پیادەم و پارە سوارە
راوکەری ئەوم لەئەم دیارە
جارجار لەدۆڵێک ئەحەسێتەوە
کەئەچمە سەری ئەسڵەمێتەوە
گومبەتە ئەداو بەتاو رائەکا
من بێ (ملجا) و بێ پەروا ئەکا
بەڵام رۆژێ دێ دەردەستی بکەم
بەپەت وەکو سەگ دەست رستی بکەم
چەکمەحەساری ئەکەم وەکو شێت
راکێشی ئەکەم ئەیخەمە ژێر پێت!

کۆیە: ١٩٤٨/٩/١٢

بێ گومان کەئەمە دوا شیعری دڵداربوو، پاش ئەمە چ شیعری دی نەگوتووەو تەنیا دوای نووسینی ئەم پارچە شیعرە، شەست و یەک رۆژ ژیا.

## شیوەن بۆ دڵدار

هەی ڕۆ کاکە ڕۆ کاک دڵدارم ڕۆ
هاوڕێ ی بەنرخ و بەهادارم ڕۆ
شاعیری گەنج و پڕ شعورم ڕۆ
ئەدیبی گەورەو بێ قسوورم ڕۆ
محامی گەلی هەژارانم ڕۆ
ڕێ نیشاندەری بێچارانم ڕۆ
دڵداری زاناو زۆر فەننانم ڕۆ
خاوەنی بیری بەرزو جوانم ڕۆ
گەنجێکی پاک و پێگەیشتووم ڕۆ
هونەرمەندێکی تێگەشتووم ڕۆ
لاوێکی ئازاو حەق پەروەرم ڕۆ
تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەرم ڕۆ
شەوچرای شەوی کوردستانم ڕۆ
هیوای دواڕۆژی نیشتمانم ڕۆ
گەنجی ڕەنجوورو داخ لەدڵم ڕۆ
ئەسیری چاڵ و چەو گڵم ڕۆ
خونچەی ئەشکوفتەی هەڵوەریوم ڕۆ
ئەوجەوانێکی خێر ئەدیوم ڕۆ
کۆچکردووی یازدەی چل و هەشتم ڕۆ
یونس ڕەئووفی پاک ڕەوشتم ڕۆ
هەیڕۆ کاکە ڕۆ کاک دڵدارم ڕۆ
هاوڕێ ی دڵزاری دڵبەبارم ڕۆ

کۆیە: کۆتایی مانگی ١٩٤٨/١١

## سەختی ژیان

لەرێگەی سەختی ژین تاکو لەکێوێ ڕەت نەبم دووسەد
کەژو بەحرو بیابانم لەپێش پەیدا دەبن وەک سەد

حەبانیە: ١٩٤٤

## ڕەشەباو درەختی داچەسپاو

١

باغەکەمان
کەپڕپڕ بوو لەگوڵی جوان
لەپاش سەرماو سەهۆڵ بەندان
لەپاش زستان
زستانێکی زۆر تووش و سەخت
بۆ گەلێ وەخت
بەبای نەورۆز و نەوبەهار
بەبای وەعدە
کەمزگێنی هێنی سەعدە
بەفری زستانی بردەوە
سەهۆڵ بەندانی کردەوە
باغەکەمان
ژیایەوە
بووژایەوە
جوانتر سەری هەڵدایەوە
لەگەرمەی بەرمونەقی یا
لەگەشیا
کەبولبولان
لەسەر چڵان
بەرامبەر بەخونچەی گوڵان
ئاوازی کامەرانی یان

## کوردستان بە هەشتە

بەڵێ نایەنمـــــان بە لێنی داوە
بەهەشت بۆ ئێمـــە تەرتیب دراوە
بە حـــۆری جـــوان و گـــوڵشـــەن و ناوی
کەوسەری شـیرین نەخشین کراوە
جـاهەر جـار خـاکی کـوردان ئەبینم
کـانی و سـەرچاوە و باغـان ئەبینم
کـە پڕ لە شـۆخی ناو قـەد باریکن!
ئەڵێ ی لە خـولدم ریزوان ئەبینم!

## (شێفتەی قەد عەرعەرێکم)

شێفتەی قەد عەرعەرێکم شۆخ و شەنگ و نەو نەهال
سـینە باخ و زوڵفی زاغ و روو بەخـاڵ و دیدە کـاڵ

نازک و نازدار و دولبـەر سـەروەری زومـرەی خـوبان
قیبلە گاهی عاشقانی غەم زەدەی دڵ پڕ خەیاڵ

لەنجە کـۆتر رەوتی ئاهو چاو بە خـەو پەرچەم پەشێو
کـوڵمـە پشکۆ قـژ رحانی جـەبهە رۆژ ئەبرۆ هیلال

سـەرکەش و لاسار و دڵ رەق بێ وەفا خاوەن جەفا
تەفرەدەر دایم بە وەعدی بێ سـەر و حـەددی ویصال

دەم بە خـەندە و پێکەنین و دان دوڕ و شـیرین زمان
خاوەنی حوسن و جـەمال و صاحبی عـەقل و کەمال

جـازبەی عـشـقی بە تەرزێ رۆحی کێشاوم کـەوا
هەنگی دڵ بەندە بە شەکری کوڵم و شـەهدی لێوی ئاڵ

چونکە بێـزارە لە زاری لەم دەمە کـەیفی دەوێ
کەیفی چی (دڵزار) بەخوا دڵ قـەت لە غـەم نابی بەتاڵ

## نائومێدی

لـە دەس جــەوری فــەلەک ئەمــڕۆ گــەلێ زار و زەبونم مـن
بـەبێ شــیــر و رم و خــەنجــەر جگەر زامــار و خــوونم مـن

لـە مـەیخانەی خەفەت هـەردەم خـەریکی خەمری خـەم بەخشم
رەفـــیـــقی بادە نۆشــانی بـەڵای گـــەردوونی دوونم مـن

چـراغـی رەوشــــەنی ژینـم لـەناکــــاوێ بـە هـەڵمـی غـــەم
کـــوژاوە وا لـە مــــەیدانـی ژیان بـێ رێ و شــــوونم مـن

لـە ژێر باری گــرانی غــەم چـەمـا ئـەلفی قــەدی شــەنگم
لـەناو باغـی گــوشـــادی دا هـەمـــیـــشــە واو و نوونم مـن

بە تـەرزێ دەســتی نومـیـدم لـە دنیـا شـوشـتـووە ئـەمـڕۆ
دەڵی ی مـــاســـیـــێکی بێ هـێـــزی بنـی گـــۆمـی نـەبوونم مـن

ئەوەند رەنجـوور و غـەمبـارم لـە حـەسـرەت دەردی خـۆم و گەل
لەناو قـیـڕ و قـوڕی مـەینـەت بەڕاســتی ســەرنخـوونم مـن

ئیـــتـــر نـازانم ئەی (دلـزار) چ ســـــودێکی هـەیە ژینم
لـە ژێری وا نـەڵێم یاخـــود لـە حـــالاتی جـنوونم مـن !!

## براگەل سەیری

براگــەل ســەیری گــوڵزاری وەتەن کــەن چەندە نەخــشــینە
ســـــەرەندازەی بە ئەندازەی چەمـــــەن رەنگار و رەنگینە

سـوپای شـادی ئەوا دەشـت و کەژ و کۆی گرتەبەر یەک سـەر
لە هـەر لا سـەیر ئەکـەن رەقـسـی گوڵی نیـسـان و نەسـرینە

بەبێ مەی مـەسـت و مەدهۆشـە لەناو گوڵشـەن بەشـەر چونکە
بە بۆی نەسـرین و سـومـبـول ، گـوڵ، هـەوا یەکبـارە عـەترینە

لـەناو باغ و چەمـــەن بولبــول عـــەجــەب ناڵەو چریکەی دێ
ئەڵێ : مـــزگـێنی ئەی گـــوڵشـــەن بەهـار هات نۆبەتی ژینە

بەڵێ ئەورۆز بەراســـتی جـــەژنی پیـــرۆزی ســـەری ســـاڵە
لەســـایەی ئەو هـەمــوو دنیـــا بە وێنەی گــومــبــەتی شــینە

ئەمـا سـەرمـا بڕا بەفـر و سـەهۆڵ و بەسـتـەڵەک گشـتی
کـەتیـشـکی رۆژی ئەورۆز تینی دا ئـەم خـاکـە شـیـرینە !

بەتەرزێ جـوان و خـەمـڵـیوە چەمـەن وەک جـەننەتە ئەمـرۆ
لەبۆ هەرلا ئەچی دەشـت و بەهـەشـت و ســـوولی زیوینە

عـــەزیـزان یادگـــاری مـــیـلـلەتی خـــۆتانە ئەم جـەژنە
بەبێ شک چاوی گـشـت کـوردێ لە شـادی پڕ لە ئەسـرینە
ئیـــتـــر (دڵزار) کـــە خـــۆشـی زۆر لە ئەورۆز دی بزانن بەس
مـــرازی یادی پێـــشـــینە ، ئەوەک دەرخـــســـتنی دینە !

کۆیە:١٩٤٦/٣/١٩

# بۆ عومەر جەلال

بژی هەر بژی ، بژی کاک عومەر
گەنجی هوشیار و ئاغەی هونەروەر

ئێمە بێ باک و تۆ جگەرسۆزی
بەراستی هەرتۆی نیشتمان پەروەر !

هۆش و ئەفکارت ئەوەندە تیژە
دڵ دەقەڵێشێ وەک نووکی خەنجەر

لەسەر ئەم حاڵەش یەکەم فاشستی
هاوتای فرەنکۆی لە بیرو باوەڕ

تەقدیری کاری ئەتاتورک ئەکەی
ئەسەف زۆر ئەخۆی بۆ بەختی هیتلەر !

برام نویشکی قەوماو قاڵ کەوە
ئینجا بڕیاردە و راستی دەرخەدەر

بێشک سیاسەت لەگەڵ ریاسەت
ماوەیان زۆرە و نابن بەرابەر !!

ماکینەی دڵ و دەروونی عاقڵ
چون ئەبێ وا زوو بێتە جۆش و گەڕ

سەرەک وەزیری ئێرانی خوێنمژ
قەوام سەڵتەنەی زۆرداری بەدفەڕ

دڵنیات ئەکەم قەد سەرناکەوێ
بەرامبەر هێزی ئازادی پەروەر

ئەو هەڵبژاردنەی ئەو مەبەستیەتی
هەرگیز پێک نایێ و قەد ناچێتە سەر

حیزبی بەهێز و بەرێزی توودە
کە هەر یەکێکیان وەک شێرێکی نەڕ

بەرامبەر زوڵمی ئێران دەوەستێ
بۆ گەلی ئێران دەبێتە رابەر !

ئینقیلابێکی ئەو تۆ روو دەدا
لە خاکی ئێران تاک بێ لە خاوەر !

کورد و ئازەری ، فارس و ئەرمەن
ئەژین پێکەوە بێ کووکە و کەسەر

کەری فاشستی و کۆنە پەرستی
دەبا هەروەکو کەری نیوە زەڕ ،

قورگی درێژ و کلکی بەرز کا
مێشکی ئەکوترێ بە تێلاو تەبەر !

بێ شک لەشکری مەلا مستەفا
دەست ئەکاتەوە تا ئاخر ئەفەر

چرای ئازادی هەر چەندە کز ئەبێ
بەڵام مەحاڵە وەک بزۆتی تەڕ

بە هەناسەیێک با بکوژێتەوە
کاتێ لە ئاگر فڕێ درایە دەر !

کۆنە پەرستی مۆدەی بەسەرچوو
ڕۆژی ئازادی لە کەل هاتە دەر !

ڕێگەی هەق بگرە ڕاست و ڕەوانە
مەڕۆ بە ڕێگای چەوت و تەنگەبەر !

ئەگینا بەخوا ڕێگا دەرنابەی
لە چوڵ و چاڵی دنیای پڕ خەتەر

مەڵێ نەزان بوو دڵزار نەیزانی
بیری تەواوم باوێتە دەفتەر

ئەگەر تەواوم بەدەرخستبا
ئێستە لە مێژبوو لێمان بوبوە شەڕ

نومێدموارم ئیتر کاک عومەر
لەشیعرەکانم نەبی دڵ کەدەر

هەروەک بە هیوام پاشی خوێندنەوە
چاکی تێ بگەی جیا بیکەیتە بەر !!

## ئەی کۆنە پەرستان

ئەیکۆنە پەرستانی خەیاڵ خاو و لە هەق دوور
ئەی دۆست و کەسانی کەسەر و جەهل و کزی نوور
بێ سوودە لە پێش بارگەو و کاروانی گەلانا
راکردن و رێ گرتن و راگرتن و سەگ لوور !!

## بیرکردنەوەی شێتێک

جارێ شێتێکی رووت و پێ پەتی ،
بیری کردەوە لەسەرخۆ گوتی :
باشە گەر دەریا شۆربا بوایە ،
دەبوو چەند نانی پێوە بخورایە ؟!

## بۆ دەوڵەمەندێکی رەزیل

زگەستوری ورگن بەرازی بەزیو !
هەتاکەی دەنازی بەزێڕ و بە زیو !
بەمارت بەسەر چوو رەزیلی رزیو ،
ژیانت لە دەست چوو بەرەو گۆڕ خزیو .
لەبۆکات و رۆژانی پڕ تەنگەبەر ،
شتێکی بە کەڵکت نەچاند بێتە بەر .

١٩٨٧/١/١٠

## سروودی گەنجی
## وریا ڕاپەڕن

گەنجی وریا راپەرن هەروەکو شێری ژیان
جەرگی دوژمن هەڵدڕن تابەکەی زوڵم و زیان
گەنجی وریا راپەرن

بۆ نەمانی زوڵم و دەرچوونی نەزانی
بۆچەقانی داری خۆشی و کامەرانی
بۆ ژیانێکی بە نرخی جاویدانی
کار و کۆشش کەن بە ئاشکرا و نیهان
گەنجی وریا ڕاپەرن

تابەکەی میللەت ئیتر حەسرەت بنۆشین
تابەکەی ئاخر جلی زیللەت بپۆشین
ئێمە لای خۆمان بەهۆش و دڵ بەجۆشین
تابەکەی بمرین لەژێر باری گران
گەنجی وریا ڕاپەڕن

نابێ کاری ئێمە قەت سیستی و شلی بێ
رەمزی گەل پێویستە هەردەم یەک دڵی بێ
بۆ گوڵی ئازادی هۆشمان بولبولی بێ
با بژین ئێمەش دەبا وەک میللەتان
گەنجی وریا ڕاپەڕن

دەوری زۆرداری ئیتر رۆیی بەسەر چوو
شوومی تاریکی شەوی بێ سوود و فەڕ چوو
رۆژی ئازادی بەدەر کەوت و کەدەر چوو
روشنی خستە زەمین و ئاسمان !!
گەنجی وریا راپەرن

## سروودی برایانی مەکتەب

برایانی مەکتەب دەسا راپەڕن
دەمی راپەرین و خەبات کردنە
نەزانی و نەفامی لەنێو لابەرن
زەمانی نەزانی لەنێو بردنە !

*

بەگوفتاری چاک و بە کرداری باش
بەبروایەکی زێدە توند و بەتین
بە گوڕ وەرنە مەیدانی هەوڵ و تەلاش
بکێڵن بدێرن گوڵستانی ژین

*

بەزانینی راست و رەوان رێ ی ژیان
ئەدۆزرێتەوە نەک بەزانینی خوار
بە زانینە ئەمڕۆ کە زۆربەی گەلان
ئەژین شاد و ئاسودە و بەختیار !!

## میللەتی مەزڵوم

میللەتی مەزڵووم و برسی پڕ بەدەم هاوار ئەکا ،
رۆژ و شەو نەفرین لە رۆحی پیسی ئیستعمار ئەکا

بێ گومان میللەت بەهۆی کردار و بیری رەوشەنی
هەوڵ و هیمەت بۆ نەمانی وەحشەتی زۆردار ئەکا

هەر کەسێکی حەز بکا بژیێ بە خۆش و کامەران
کار و کۆشش بۆ ژیانی نیشکەر و جوتیار ئەکا

بێـــشـــک و شـــوبهـــه نهمـــانی بیـــری پیـــسی عـــونســـوری
مـــیللـهتی مـــهزڵووم لـهژێر پـهنجـــهی زوڵم رزگـــار ئـهکـــا

رۆژی رووناکی حـــهقـــیـــقـــهت ئـهرزی رۆشـن کـــرد کـــهچی
غـــولی فـــاشـــســـتی بڵـێـســـهی نووری حـــهق ئینکار ئهکـا

کـۆشـــشی مـــهردانه ئهی مـیللـهت به روح و مـــاڵ و ســـهر
دوژمـنی خـــــوێنمـــــژ لـهبۆ دەرچوونه دەر ناچار ئـهکـــا

دوژمـنی گـشـــتی کـــه ئیـســـتـعـــمـــاره هیچ خـۆی ناگـــرێ ،
گـــهر بزانی گـــهل لـهگـــڵـــیـــا بی وچان کـــوشـــتـــار ئهکـا

هـهر کـــهسێ ئیـــمـــرۆ بهراســـتی جـــهوهـهری حـــهق تێ بگا
بێ گـــومـــان رەفـــتـــار بـه بیـــر و باوەڕی (دڵزار) ئـهکـــا

کۆیه :١٩٤٦

## مێشی مەینەت

مـێـشـی مـهینهت زۆر ئـهســهف وا هاتە ســهر ڕێی ڕەحـمــهتم
ڕەحـمـهتی گوڕی بە زەحـمــهت سـا لـهســهر زێی زەحـمــهتم !!

## شەپۆلی مەینەت

شـــهپۆلی بـهحـری مـیـحـنهت دای لـهپێـچکهی پردی ژینی من
لـهبۆیه خـــاکی عـــهشـــشـــار و زوبێـــر بۆ جێ نشـــینی من !!

## دیمەنی سەرخۆشان

سەیری سەر خۆشان کە ئێواران بەرە و ماڵ دێنەوە
وەک سەگی گەڕ وا لەناو چڵپاوێ دا دەخولێنەوە
هۆش و بیریان نامێنێ وەک کەر لەبەرد سەرسەم ئەبەن ،
دیمەنێکی پیس ئەبەخشن لەو دەمەی دەڕشێنەوە !

## پەیمانی پۆرتسمۆس

کۆتی پێمانە ئەوەک پەیمانە ئەم پەیغامەیە
دیاری دا دیاری دیاری لەندەنە ئەم نامەیە !

## بۆ دیلان

حازر بە لە موعد لە هەمان کات و هەمان جێ
یەعنی لە بەری سیلەیی سەیوان لە سەعات سێ !

ڕۆژێکی هاوینی ١٩٥٤

## ڕۆڵەی خوداوەندی جەماڵ

ڕۆڵەی خوداوەندی جەماڵ
هەوێنی میشک و عاتیفە و
نازەنینێکە بێ میساڵ
کچێکە باڵابەرز و ڕێک ،
گۆنا گڵۆکی سوور و گەش ،
ددانی وەک لوء لوئی تەڕ
گەردەن و سینە ساف و لووس
تازە عومری گوزەر ئەکا ،
سەوداسەرم ئەکا هەر چەند
لەبەر دەمما گوزەر ئەکا ،
کە پەرچەمی پەخشان ئەبێ
هێلانەی دڵ وێران ئەبی
بولبولی دڵ پەرواز ئەکا
بگاتە سەر چڵی گوڵی

کانگەی کەماڵ
شیعر و خەیاڵ
تەمەن مناڵ
دیدە کەژاڵ
دوو لێوی ئاڵ
چەناگە چاڵ
مەم سێوی کاڵ
لە چواردە ساڵ
دەرچێ لە ماڵ
هەروەک خەزاڵ
بەبای شەماڵ
دێتە زەواڵ
بێ پەڕو باڵ
سووری ویصاڵ

## بۆ وەستا جەلالی نەجار

چاوەکەم ئەی کاک جەلال وەستای نەجار
دێتە یادت رۆژەکەی خۆشی بەهار

هاتمە خزمەتتان لەگەڵ چەند تەختە دار
پێم گوتی : بۆ خاتری تەوشو مشار

تاقە سندوقێکی گچکەم بۆ بکە ،
بێ دەم و دەروازە بۆ پارە و سکە !!

پێت گوتم : باشە بە دەنگێکی نەرم
بۆ هەموو فەرمانێ من فەرمانبەرم !

دارتراشێکی حەقیقەت پەروەرم
کاری کاک دڵزار بەسەر چاو و سەرم

داخەکەم ئەمما لەبیر خۆت بردەوە
زاری دڵزارت لەراست خۆ کردەوە !

ئەت ئەزانی گیپەخۆری بێ خەبەر
لووت مغەیری کەللەخڕ لچ تەژگەبەر

قەت لەچنگ دڵزاری دەرناچێتە دەر
چونکە تیژە تیغی شیعری وەک تەبەر

روو لــه هــەر لاکـــــــــــەی بــەرەنــگــارت نــەبــێ
بــێ گـــــــــومـــــــــان زۆر دەرد و ئــازارت نــەبــێ

چــاوەکـــــــــەم بـاوەڕ کـــــــــە بـەخـــــــــوای تــۆ نـەبـای
خـــــــــەنجـــــــــەری تـیـــــــــژی زمـــــــــانم لـێ نـەدای

جـــــــــەرگـــــــــتـم دەیـنـایـە دەر بـێ نـای و وای
ئێـــــــســـــــتـــــــاکـــــــەش هـەرچـەند کـــــــە هـەر تۆ بێ وەفـــــــای

نامـــــــەوێ شـــــــیـــــــعـــــــرت بـەســـــــەردا هـەڵ بدەم
کـــــــردەوە و کـــــــارت نیـــــــشـــــــانی گـــــــەل بـدەم *

کۆیە :رۆژێکی هاوینی ١٩٤٧

* ئەوە بوو هەر ئەو رۆژی سندوقەکەی بو کردم !

## بەندیخانەی کۆیە

چاوگەی پاکی شادیم پیس بوو      تووشـم بە تووشـی پۆلیس بوو
سـەر لە ئێوارێ
هـەژدە بە جارێ
بۆم هاتنە خوارێ
هـەردوو دەستیان زنجیر کردم      بۆ بەندیخانەیان بردم
هـەموو سونگی تاق
جووت جووت و تاق تاق
هاتن بۆمـەراق

تا خستمیانە ژوورەوە      چ ژووریَ هەر لە دەرەوە
لەبەر بۆگەن پیاو
دێتە گیانەڵاو !
ئەکەوتە سەر چاو
ئەمەش هەر هیچ بەڵام ئینسان      لەبەر تەپۆ و کێچ و مۆریان
بەدەگمەن ئەبیَ
ساتیَ ناخەویَ
لە رۆژ و شەویَ
لە تەختەکالۆس مەپرسە      کە چەند بە ئازار و ترسە
هەروەک زریَ دار
ئەدا پەلامار
ئێمەی گرفتار !
چەند تاریکە هێندەش تەنگە      نیوەرۆی وەک شەوە زەنگە
رتوبەت دارە !
کانگەی ئازارە !
پڕ زیندەوارە !
تەپەی پۆستاڵی پۆلیسان      یادی پردی غازی دیسان
نۆی ئەکاتەوە
دڵ ئەخاتەوە
خەیاڵاتەوە
چوونەدەر رۆژیَ دوو جارە      یەک بەیانی یەک ئێوارە
بۆ ئیشی سەر پیَ
ئەویش جیَ بە جیَ ،
ئەبیَ کۆتابیَ
میز کردن هەر لە ناوەوە      لە عاستی کوپەی ناوەوە
لە نۆینێک ئەکریَ
خوا هەڵی ئەگریَ
بۆنی لیَ نابریَ

هەر لەسەر شێوازی کۆنە     خۆراکی بێ گۆشت و ڕۆنە
نیسکی بێ خێرە
ساوەری سوێرە
یەک دوو کولێرە
نیسک و ساوەر لەبە سوێری     باوەڕکە تۆ پێی ناوێری
کولێرەی ترشا و
هەروەک سماقاو !
ناودێنی لە چاو !
هەر دیوارەی لەدوو مەترە     ئەستووری و پانایی پترە
بەبێ زیاد و کەم
بۆ ئازار و غەم
هاتۆتە بەرهەم
وێنەی هەرەم هەلێنراوە     وەک ئیڤلی دارێژراوە
لە پێش فەوتانی ،
دەوری توغیانی
نالی عوسمانی !
بۆ مەتحەف ئێجگار لەبارە     بە ئیچقەلاوە ئاثارە
ئاثارێکی وا ،
بەرز و ئاشکرا ،
وەک تاقی کیسرا
پۆلیسیش وەک واشەی برسی     لەهیچ لانادا ناپرسی
هەرچێکی بۆت هات
نیوەی لائەدات
لەبۆ خۆی دەبات
گوللەی ناحەق حەق نابڕێ     میللەت ئەژی قەت نامرێ
قوڕبەسەر بیڤن
قەلاتی دوژمن
نەکرێ سەروەر بن

کۆیە: ١٩٤٨

## گۆرانی ڕەنجەران

ئەی ڕەنجبەران   تێکۆشەران
وەرنە مەیدان
بەماڵ و گیان
لە بۆ ژیان
بۆ ژیانی ، کامەرانی
دور لە بەدکار
دوور لە زۆردار
لە ئیستعمار
دوور لە دیلی   لە زەلیلی
لە ڕەنج مژین
لە ژانی ژین
لە زار و شین
لەژێر ئاڵای   بەرز و باڵای
شێری خەبات
کە بۆ نەجات
خۆی کرد خەڵات
شێرێ کەوا ،   باخی ڕووا ،
بەشان و مل
بەخوێنی دڵ
هنایە گوڵ
پەرژینی کرد   ڕەنگینی کرد
زۆر بە چوستی
بە زانستی
سۆسیالستی !
تاک
مەجبووری کەسێکم کە وەکو سەروە بە قامەت
ڕەحمێ کە نەکا زەحمەتە دەرچم بە سەلامەت !!

# بۆ هەڤالانی کوردستانی

هەڤـــالانی کـــوردســـتـــانی
گـــوێم لێ بگرن زۆر بەجـــوانی

ئەگـــەر ئێـــوە راســـە کـــوردن
بۆ کـــوردســـتـــان پەیژە و پردن

ئەبێ خـــزمـــەتکاری کـــورد بن
خـــاوەن هۆش و بیـــری ورد بن

ئازاردانی ئێـــمـــەی دڵســـۆز
خـــزمـــەتە بۆدوژمـنی هۆز

گـــەر دژی ســـۆســـیـالســـتی بن
دیارە ئەبێ فـــاشـــســـتی بن

پیـــــاوی باش و دیمـــوکراتی
هەرگـــیـــز نابێ بە شـــەللاتی

رێ لە جـــاســـوس و جـــاش بگرن ،
رێگا لە پیـــاوی باش مـــەگـــرن

تکام وایە تاقـــمی شـــێـــرە
گـــوڵزاری گـــەل نەکـــا گـــێـــرە

هیـــــوادارم ئەی هەڤـــالان
کـــەمێ عـــەقڵ نەخـــتێ ویژدان

بەکـــار بێنن تا بێ گـــومـــان ،
بکـەونەوە ســـــەر رێ ی ژیان !!

ناوەگرد :١٩٦٥/٦/٢٦

## بۆ کاک بەکر !!

هـۆ کـــاک بەکـــر ، هـۆ کـــاک بەکـــر
ئەی شـــیـــرین هـەروەکـــو شـــەکـــر !

پێـــویـست ناکـــا حـــیـلە و مـــەکـــر
بـەکـــاربێـنی یاخـــــو فـــــیکر !!

لـەگـــــەڵ کـــــیـــــژۆڵانی ناسـک
ســـپی ســـــەنگ و ســـپی باسـک ،

چـاورەش و گـــــــەشـی وەک ئـاسـک ،
کـــە جـــوانیـــان لێ ئەتکێ تک تک !

چـونکە لـە خـــــۆوە مـــــاهـیـــــری
لـە زگـــمـــاکـــەوە ســـاحـــیـــری

بۆ قـــــەڵای جـــانان قـــاهـیـــری
گـــــــەرچی بـە زاهـر تـاهـیـــــری

بـەڵام نـابێ کـــــاکی نـەخـــــۆش
نابێ قـــەت ئێـــمـــەی دڵ بـەجـــۆش

بێـــینـە مـــەیدان بێ هـۆش و گـــۆش
بکەین فـــرمـــانمان فـــەرامـــۆش

ئــەم ژیـــنـــە نـــا ژیـــانـــی تـــر ،
بــژی ڕۆژ و شـــــــــەوانـی تـــر ،

لادە ، لـەبـەر خـــــــەمـــــــانی تـــر
(گـــوڵە) و (ســـەفـــیـــە) و نەوانی تر

هــــەتـــا تـــوشـــی زگ چـــوونـــەبـــی
مــل بـاریـكـی وەک مــــــــوو نـەبـی

هـــــەتـــا بــــێ ڕەنـــگ و ڕوو نـــەبــی
پێـــویســت ئەكـــا بەد خـــوو نەبی

## یاری و مەتەڵ

چـوار كـــــــرێكار و پـێـنـج بـرجـــــــوازی
دوو ئـازادیـخـــــــواز پـیـــــــرێكی نـازی
سـێ ڕۆژ و شــــەوێ قـــــازێك و دوو قــــەل
دوو مـــــەل و سـێ مــــار كـــۆترێكی گـــا پەل
دوو دوژمـن دوو دۆسـت جــاشــیـكی گــومــڕا
نـۆنـۆ بـژمـــــــێـــــــرە دوژمــن دوای بـڕا !

## تلیشی تاقی كیسرا

تلیـــــشی تاقی كــــیـــــســـــرا دەمـــــێكە دەڵێ : برا
ئەم جـــــیـــــهـــــانە جێ دێڵێ ، بەناچاری ، هەرچی زا

١٩٦٤/٤/١

## جوانی غەمگین

جوانی غەم نالوود توانا و تاوی
گەلێ زیاترە لەسەر گیان و دڵ
لە جوانی گەش و پێکەنیناوی
ئافرەتی قۆزی روومەت پەڕەی گوڵ

دەرگەڵە :١٩٦٦/١٢/٢٦

هیچ سەیر نیە منداڵی ساوا
ئەگەر بترسێ لە تاریکایی ،
سەیر ئەوەیە لە پیاو و لاوا ،
زۆر هەن ئەترسن لە رووناکایی !!

## دنیای دوون

دنیای دوون پەروەر لە غەدرا مارە
شادی و شەربەتی هەر ژان و ژارە
رێگەو رەوشتی بەد و بەدفەری
هەمان رەوشت و رێی ئیستعمارە !!

دەرگەلە:١٩٦٦/١١/٣٠

هەرکەس بەراستی گەلی خۆش بوێ
گەل خۆشەویستی پێ ئەداتەوە !
خەباتی گەرم و بروا بە خۆ بوون
ویژدان و زاتی نوێ ئەکاتەوە !!

ولیانی قەرەداغ :١٩٦٨/٧/٢٨

## كۆچی دوایی حیکمەت خدر

بیست و سێی سێی هەزار و نۆ سەد و شەست و نۆ بوو
مەدحەت لە کۆچی حکمەت دووچاری کاکە ڕۆ بوو !

١٩٦٩/٣/٢٣

## غەم خواردن

ڕێ بەغەم نادەم کەمن بخوات و یەکسەر غەم نەخۆم
نانی سەرشۆری و کەمی ناخۆم و بۆ خۆم کەم نەخۆم

## روخساری ئەستی

لە ڕەنگی سووری گوڵ باخ
لە خوێن و بەفری سەر شاخ
لە پرتەوی شەو چراخ !
لەگەڵ ئەشک و لەگەڵ ئاخ !
ئەهۆنمەوە هەڵبەستی
وەسفی روخساری ئەستی !

## دیسان ڕەشەبا

بارەش کز و کپ بوو تاوێ
کەچی لەپڕ لەناکاوێ
لووراندی و تێی هەڵکردەوە
بەکردەوە
رەونەقی باخی بردەوە !
زیانی دا ،زیانی زۆر
داری کۆر

خۆی رانەگرت و راقەنا
کەوتە ژێر پێی دێوی فەنا
هەزاران گوڵی هەڵوەراند
نۆبەرەی نایابی پەراند !!
هەزاران هێلانەی رماند
کۆتری مراند !!
بەڵام دیسان درەختی ساخ
وەک لووتکە شاخ
خۆی راگرت و رانەقەنا
راناقەنێ
بە هیچ هێزێ هەڵناقەنێ !!

## نەهێنی بپارێزە

گەرەکتە گەر ئازاری خۆت ،
نەدەیت و کارت سەرکەوێ !
زینهار قەت ماوەی رازی خۆت ،
نەدەی کەرۆژێ دەرکەوێ !!

## لۆنای دەیەم

رۆژی چواری ، چواری شەست و شەش بوو چەرخی بیستەهەم
بوو بە مانگی دەوری ئاسمان (لۆنای) دەهەم

## بۆشەهید سەید تەهای
## سەید عەزیز

ئەی شــەهیــدی ڕێی نیــشــتــمــان ،
گـــــڕی مـــــەردی و گــــوڵی ژیان
ســـــــەید تەهای ئازا و دلێـــــــر،
ئەی جـــەنگاوەر ئەی بێــچـــوە شـــێــر !
چەشـــــەی خــــوێن و ئاگـــــر و ئاسن
ڕۆژانـــی جــــــــــــەنـگ دژی دوژمـــن
خـــــەریک بووی هـاوســـــەریّ بگری
بـژی بـە خــــــــــــۆشــی ئـەک بمـری !
بیـــســت و حـــەوتی دوانزەی ســـاڵی
شـــەسـت و هەشـت بوو خـــوێنی ئاڵی
دڵـــی تـــازە گـــــــــــــــەنجـت ڕژا
بـە زۆر بـەســـــەر خــــــاکـــــا پڕا
لـە هـەولێـــرا دەســـــتـــێـكی ڕەش
هەڵی پچـــــڕیت ئەی گـــوڵی گــــەش
ئێـــســـــتـــاش یادت کـــاکـــە تەها
یـــادێــــکــــە پـــڕ نـــرخ و بـــــەهـــا
لـەناو دڵـی هـەمـــــــوومـــــــانا ،
لـەناو گـــــیــــــــانا لـە ویـژدانا ،
نـــەژی ،نـــەژی، جــــــــــــاویدانـــە
کـــــــــــــردەوەت لـەپێـش چاوانـــە

## رۆست و گرتک

* * *

رۆست و گرتک
ئەی جوانترین
ناوچەی زەمین
جوانیت تک تک
وەک جواناوی
نازدارانت
دڵدارانت
نەتکی تک تک
رۆست و گرتک

* * *

## بۆ سامۆی میهرەبان

لە ئاسۆی سۆز و ئایینی منا
سامۆ سوهایە
لە بنکی دەریای ئەوینی منا
دوڕی یەکتایە
گیانێکی پاک و پوخت و شیرینە
بەر لەوەی لەش بێ
دڵێکی ساف و بێگەرد و کینە!
کە دوور لە غەش بێ
فیداکارێکی رێی ئازادییە
تا بڵێی مەردە
دڕکی ناو چاوی خوای بێ دادی یە
ئازا و نەبەردە
هاوڕێ و هاوبیر و جگەر سۆزمە

راست و میهرەبان
وەفادارێکی گەل و هۆزمە
شەیدای نیشتمان
لەسەر چاکترین تیۆری زانین
نەروا بەرێوە !
هیمەتی بەرزی بۆ ئازادی ژین
وەک لوتکە کێوە
بیر و قەلەم و رەوشتی بەرزی
هەرسێک جوانن
وشە و هەڵبەست و نووسینی تەرزی
روون و رەوانن
چاوە جوانەکەی وێل و شاعیری
رەونەقی ژینە
ئەڵێ ی ئەستێرەی نێوان چادری
گەردوونی شینە
لەناو سەرچاوەی چاوەکانی ئەو
گیان و بیری من
خەریکی مەلەن بە رۆژ و بە شەو
بێ ئۆقرە گرتن
گیانم ئاوێتەی گیانی سامۆیە
جوێ نابێتەوە
ئەوێنی ئەوم هێند لە دڵ کۆیە
قەت ناچێتەوە
لەواتەی کوردی وەک دوڕ و مەرجان
ملوانکەی هونەر
ئەکەمە ملی سامۆی میهرەبان
سامۆی هونەر وەر

هەولێر : ١٩٧٠/٦/٢٩

لەبابەت ووشەکانی (لەمەوبەر) و (لەمەولا) و (کەژ) و (کژ)ە وە
بۆ خوشکە (بڕوا) پێشکەشە

* * *

(لەمەو بەر) بەردی لی باریّ بەسەرچوو
(لەمەولا) هەر بزانە رۆژی دەرچوو !
لەباتی لەفزی شیرینی لەمەولا
لەمەو بەر قەت مەبێژە خوشکە بڕوا
یەکەم پێش و ئەویتر پاشە مەعنای
ئەبی بزانی گەر هۆکر بە ئینشای
لە پاشان تۆ لەباتی کژ کە (وەرزە)
کەژت نووسیوە ، کێوە ، سەخت و بەرزە
ئومێدم وایە سا خوشکی بەقیمەت
بەدقەت بی ، بەدیقەت بی ، بەدیقەت !!

## بۆ گوڵێ ی خدروونی بۆڵی

گوڵی گوڵزاری زێبایی گوڵێیە !
گوڵێ شۆخێکی وەک زین و زوڵێیە !

## (دنەدان بۆ تێکۆشان)

هەستن ، هەستن ، هەستن ، هەستن
تاکەی هەر بێ هۆش و هەستن
گێژ و گێل و حۆڵ و مەستن !
بێ کارمو بەندە و بندەستن !
رابن ، رابن ، رابن ،رابن !
لاوی رەند و مەردی چابن
خەڵکی چۆن نێوەش وابن
زووبن ئازابن زانابن
خێرا ، خێرا ، خێرا ، خێرا !
هەرچی ، نێرە ، مێرە ، شێرە
چاو نەترس و دڵ دلێرە !
بێتە ئێرە ، بێتە ئێرە !!
هاتین ، هاتین ، هاتین ، هاتین ،
دڵ پڕ هیوا و پڕ ئاواتین
واتێنەگەن سست و ماتین
چاوەروانی چرکە و ساتین !!

## نەورۆز

خوێنی سووری نەوجەوانانت دەسا نەی نیشتمان
خوێنی پێشمەرگەی بەجەرگ و چاونەترس و قارەمان
سەیری چۆن وا بوو بە زەیتی مەشخەلی رێگەی ژیان
مژدەبی نەی کورد کە نەورۆز پێشرەوی سەربەستی یە
مژدە هێنی رۆژی ئازدی لە دیلی و پەستی یە !

## شەشی ئەیلول!

ئەمــــڕۆژەیە ڕۆژی شــــەشی ئەیلولێ لەعـــالەم
ڕۆژێکی گــــەلێ شــــوم و بەدی کــــوردی هەژارە!
ڕۆژێکە پڕ ناشــوب و غــەم و مــەینەت و ئەســتەم
ڕێژنەی خــەفــەت و غــەم وەکــو بارانی بەهارە!
ئەم ڕۆژەیە ڕۆژی خــەفــەت و شــیــوەن و گــریان
ئەمــڕۆژەیە ڕۆژی ڕەشی شــوومی گــەلی کوردان

کۆیە ١٩٤١

## بۆ گۆرانی هەمیشە زیندوو

چڵ شکا ، گــوڵ هەڵوەرا ، بولبــول نەمــا
کــاتێ گــۆران ، کــاخی ژینی ، دارمــا !
وەک (ئەپۆڵۆ) بوو : خـــــوداوەندی هونەر !
بۆ ئەوەی کـــــوردی دلێــــر و بەهــرەوەر
گــەرچی ئێــســتــاکــە ، بە لاشــە ، مــردووە ،
لــێ بــەنــاو و نــاوەرۆک هــەر زیــنــدووە !
هەر دەمــــێنێ ، هەر هەیە ، تا کـــورد هەبێ ،
دیارە وەک هەڵگوردە کـــــوردیش هەر دەبێ !
گــەورەیی گــۆران لە شــیــعــرا ســاڵ بە ســاڵ ،
زیاد دەکــات و ســیــحــری رووتی دێتــە پاڵ !
بەخــتــیــارە هەروەکــو مـن ، هاودەمێ،
گــەر لەگــەڵ گــۆران ژیابێ ســــەردەمێ !
شــیــعــری وەک ناوی رەوانی بیــســتــبێ ،
لەفــزی کــوردی پاک و پوخــتی ویســتــبێ !
هەروەکـو هۆمـێــر و فــەرجــیل بێ گــومــان ،
گــەنجی کــوردی خــســتــە گــەنجــینەی جــیــهــان !

شـــوێنی لاشـــەی ئەو ئەگـــەر چی ناو گـــڵـــە ،
شـــوێنی شـــیـــعـــر و شـــاعـــیـــری هەر ناو دڵە !
ســــــەد درود بۆ گـــــیـــــانی پڕ نازاری ئەو ،
ســــــەد چرا بۆ گـــــۆڕی تەنگ و تاری ئەو !

※ بەبۆنەی بیرەوەری ٨٨ساڵەی لەدایکبوونی و ٣٠ساڵەی کۆچی دوایی گۆرانی ئەمرەوە گوتراوە .
ستۆکهۆڵم :١٤/٢/١٩٩٢

## لاوی کورد

لاوی کورد بخوێنە خوێندن مەرهەمە بۆ زامی گەل
تیشکی زانینە ئەدا رۆشن بە ئەستێرەی ئەمەل
میللەتی جاهل لەقاقڵەی ژین و تەئریخی بەشەر
دەستە پاچە کەوتووە جێماوە لەش ئیفلیج و شەل
هەر بەهۆی عیلمە هەزاران چەشنە بالۆن و فڕۆک
پەرت و پەخشانی قوبەی شین بەوێنەی قاژو قەل
بێ تەل و رادارو رادیۆ و، تەلگراف و کارەبا
هێزی ئۆتۆم و ئیجادی پەنسلین خۆ بێ جەدەل!
داری زانین بەهۆی زانایەکان هاتوونەبەر،
موعجیزەی فەنن برا ئەک سیحرو ئەفسانەو مەتەڵ
قەومی کورد ئیشتۆتە ناو دەقنی جەهالەت تا ملی
غەیرە دەستیان گەییە رۆژو چوونەسەر کەنداڵی کەل!
بۆ ئەوەی ئێمەش بچینە ریزی وان ئەی لاوی کورد
تێ بگە، کۆشش بکە، هەنگاو هەڵێنە، بکوتەپەل!!
کۆیە: ١٩٤٦

# تیشکی بیر

ڕەفیقان ڕێ نیشاندەر تیشکی بیرە،
ئەوەی بێ هۆش و بیر نیش کا ئەسیرە
ئەسیری عاتیفەو ژێر چەنگی جەهلە
شعووری مردووەو مێشکی فەتیرە!
بینای مێشک بەهۆی زانین و خووی خاس
بەرز دەکرێ، بڵند نابێ بە لیرە!!
ئەوەی ئەمڕۆ بە مەنقوولاتی بێ جێ
بکا باوەڕ لەعەقڵا زۆر فەقیرە!
بەڵام هەرکەس بە مەعقولات و واقیع
ئەگەر ڕەفتاری کرد هۆشیارە، ژیرە!
ئەگەر پیر خوێندەوارو ژیربێ گەنجە
بەڵام گەنجی نەفام بێ کەڵکە پیرە!
وتاری عاقڵان بۆ دەردی میللەت،
یەکەم دەرمانە بۆ دوژمن زەهیرە(*)

کۆیە ۱۹٤۱

(*) زەهیر: وشەیەکی کۆنی هەولێری یانە واتا (ژەهر)
- ئەگەر زەنگینی هەنگینی    ئەگەر فەقیری زەهیری
«پەندی پێشینان»

# بابمرێ ناحەز

بابمرێ وڵ بێ ناحەزی بەدکار
کێ بیستوویەتی شاعیری دڵدار

دەس بەرداربێ لەیاری نازدار
لەپڕ ببێتە سۆفی تۆبەکار

عومری بەیانە لەخۆشەویستی،
شەوگاری خۆشە لەمەی و مەستی!

چۆن مەستیم لاچێ، مەی و مەشروبم
وا لەناو دەم و دوو لێوانتە!!

هیواو ئاواتم واپێ دەکەنێ
سەرچاوەی لەناو چاوەکانتە!!

دەبۆم بخوێنە، دڵم بدوێنە
خۆشی بنوێنە، یاری شیرینم

بابمرێ وڵ بێ، ناحەزی بەدکار
یادی ئەو رۆژو کاتە خۆشانە

فەرامۆش نەکەی تاماوی گیانە!
یادی ئەم چەم و کێڵگەو بیانە

کەڕازی ئێمەی تێ دا پەنهانە!
دەپێم دە گیانە، هەنگوینی شانە
لەم دوو لێوانە
بابمرێ وڵ بێ، ناحەزی بەدکار!!

مارەدوو: ١٩٦٦/٧/٢٥

(بیری ئەم چامەیە لەهۆنراوەیەکی شاعیری مەزنی لوبنان -ا لاخطل الصغیر - وەرگیراوە)

## دڵ

دڵیش وەک لەش و لاری پیر پیرە بێ
دڵی شاعیر و پیاوی نازا نەبێ!

## جەژنە پیرۆزە

مژدەبێ ئەی کورد، وا بەهاتەوە، هاتەوە نەورۆز
شەوانتان رۆژو رۆژانتان جەژن و جەژنتان پیرۆز

## نەوجەوانان

نەوجەوانانی نەبەز ئەمڕۆ لەناو زیندانەوە
هەروەکو شێرانی هەڵمەت بەر لەبێشەو لانەوە

دەچنە مەیدانی خەبات و کۆڕی تێکۆشانەوە
بۆ رمانی سەنگەری دوژمن بەبێ وەستانەوە

چەک بەدەست و گورج و هوشیارو رەق و تێکۆشەرن
رۆژی هەڵمەت وەک پڵنگی چنگ بەخوێن و راپەڕن

دەچنە ناوجەرگەی گەلێکی رووت و برسی و دەردەدار
دەچنە کۆڵیتی فەلاح و کەپری وەرزێری هەژار

دەچنە کانگەی کارگەرانی گورج و هوشیارو بەکار
تێدەکۆشن، هەوڵدەدەن بۆ یەکێتی دێهات و شار

بۆ نەمانی زەبرو زەنگ و رەنج مژیی و ئاغایەتی
بۆ لەبن دەرکردنی ریشەو رەگی عەبدایەتی

بەندیخانەی کوت/ نیسانی ١٩٥٠

## پێوانەی مەزنی

چەمی خوڕو دەریای هێمن، کامیان چووکە کامیان مەزن؟
زۆرداری نا، زۆر هێمنی، پێوانەیە بۆ مەزنی!

## خەباتی کورد

کـــورد وا خـــەریکە بەر لە کـــۆتایی
ئەم چەرخـــــە، چـەرخی تازە دا دێنێ

بێ ترس و پـەروا بـەخـــــوێنی لاوان
مـێـژووی خـەباتی خـۆی دەنەخـشـێنێ

بـەواتـەی نـەرم، بـەگـــوللـەی گـــەرم
زۆر بـەهـوشـــیـــاری دوژمـن دەدوێنێ

ڕەوڕەوەی مــێـــژوو بەرەو پێـشـــەوە
بـەچاپووک دەســتی خـێـــرا دەڕوێنێ

بـەکـــارامـــەیی و هـۆشـــیــــاری ئـەوا
قـــەڵاو کـــۆنگرەی نـەیار دەڕمـــێنێ!

لـرفـــــەی لافـــــاوی بـەتین و تـاوی
قــارو قــینی گــەل، دوژمـن دەپســـێنێ

هـەرچی خـاشـاک و خـارو خـەس هـەیە،
هـەمـــووی بـەجـــارێ را دەڕفـــێنێ!

تـاریـکی شـــــــەوی درێـژی دیـلـی
رادەداو رۆژی ئـــــازادی دێـــــــنێ!

ســـتـــران بێـــژی کـــورد لەهـەمـــوو لایێ
بـەســـــانی بولبـــول تێ دەچریکێنێ!

کـــەشی ئازادی لـەکـــوردســـــتـانا،
بـارانـی شـــــــــادی دا دەبارێـنێ!

قـوڕ بەســەر دوژمـن، ویســتی کورد قڕکا
بـەڵام خـــۆی دەڕوا کـــورد هـەر دەمــێنێ
کـــــورد هـەردەمـــــــــێنێ

١٩٩٣/١٢/٨

## هەڵبەست و هەنگوین

چۆن هەنگ هەڵاڵەی شیرینی گوڵان
هەڵدەمژێ و دوایی دەیکا بەهەنگوین
ئێمەش لەواتەی نایابی جوان جوان
دەهۆنینەوە هەڵبەستی ڕەنگین!!

دیمەشق: تەمموزی ١٩٨٤

## شادمانی

سروشت ئەمڕۆ لەبەر چاوم
بەراستی پاک و شیرینە!!
زەوی پیرۆزەیی ڕەنگە،
هەتاو چاو بڕ دەکا شینە!!
گزنگی خۆر لەخاوەر دا
چ نایابە، چ زێڕینە؟!
لەسەر پۆپەی چڵان بولبول
لەهاوارو لە ناڵینە!!
کەچی خونچەی لەخۆ بایی،
دەمی خەندان و خوێنینە!
دڵم پڕئاگری عیشقە،
تەنم پڕ تاقەت و تینە!
بەسەرما بەختیاری هەر،
وەکو باران لەبارینە!!

✻ ✻ ✻ ✻

هەر گەلێ ڕێ سەرفیرازی گرتەبەر،
تاجی بەرزی و سەربەخۆیی کردەسەر!

✻ ✻ ✻ ✻

# بەخێربێ مانگی ئادار

« شـــــوباتی ســــــاردوســـــــڕ رۆیی
بـەخــــێـــــربێ ی مـــــانگی ئاداری» (*)
وەنەوشـــەو ســــوســن و ســـومـــبـــول
بـەدەر کــــــــەوتن لـەگــــــــوڵزاری
گـــــوڵاڵەو نێـــــرگـــــزو نەســــــرین
لـەپـێ دەشـــت و لــەجــــــــــــۆبـاری
بــەلادادێـن، لــەڕەقـــــــــــــــانـە،
لـــەگــــــــــــەڵ پـۆپ و چـــڵــی داری
کـــچـــــانی شــــۆخ و شـــــەنگی ســــەر
بـەدەســــــــبـــڕۆکـــــــەو بەهـیــــــــزاری
چ شـــیـــــرین، چەندە ســــیـــحـــــراوی،
لـەســــــــــەر ڕا دێن بـەرەو خــــــــواری،
ئـەمـــــــــــــامــی بـەرزو شــلــکــی مــن
دەهـێـنـێ ســـــــــەربـەســــــــەر شـــــاری!!

هەولێر / بەهاری ١٩٧٣

(*) رۆژێکی بەهاری ١٩٧٣ هاوڕێ کەریم عەزیز (باوکی دڵشاد) ئەم دێڕە شیعرەی دامێ گوتی: (ئەمەم بۆ تەواو کە) منیش هەر بەوشەوە لەسەر هەمان کێش و سەروا بۆم تەواو کرد.

# هەندێ ڕێگر

جـــــێگەی داخـــــە هـەندێ ڕێگر
بەزەرگ و شـــمـــشـــێـــر و ناگـــر!

خـــۆیان دەکـــەن بەشـــێخ و مـــێخ
ڕەگی دیـن و شــــــــــەڕەف لـەبێخ

دەردەهـــێـــنن بـــەنـــاوی دیـــن،
مـن نـازانم ئـەمـــــــانـە چـین؟

توخـــمـی ئینســـان نین و گـــورگن،
شــــەو و ڕۆژ خــــەریکی ورگن!!

ملەســـتـــوورو چاو با شـــقـــەڵەن!
هـەتا بـڵێ ی بەتـەشـــــقـــــەڵەن!

ئـاگــــــر دەکـــــــەنەوە لـەبـن
دامــــێـنی هـەندێ شــــۆڕە ژن!

بۆ ئـەوەی زوو زگـــــیــــان پـڕبێ
منداڵی باوەشـــیـــان کـــوڕ بێ

کـــوڕ بێ مـنداڵی باوەشـــیـــان
تـوونا بێ ڕۆژانی ڕەشـــیـــان!!

بکرێتـــەوە گـــوڵی گـــەشـــیـــان،
هـەر کـــامـــەرانی بێ بەشـــیـــان!!

# بۆ شەهیدانی نەمر

ئەی شـــەهیـــدانی هەمـــیـــشـــە زیندوو
هـەرگـیـــزاو هـەرگـیـــز لەیاد دەرنەچوو

ئێـــوە ســــەرچاوەی شــــەرەف و شکۆن
بـەبـێ سـێ و دوو، بـەبـێ چـەنـدوچـۆن!

بـوون بـە قـــــــوربـانـی لـەرێـی ولاتـا،
لـەگـــەرمـــەی کــارو کـــۆڕی خـــەباتا!

بەخـــشـــیـــتـــان ســــەرجــەم تین و توانا
تا لەنەنجـــامـــا ســـەریشـــتـــان دانا.

ئەو رۆژە هـەردێ گـــەل هەســـتێ لەخـــەو
دەرچـێ تـاهـەتـا لـەتـاریـکی شـــــــەو!

تـەخـــــتی بێ دادی ژێر بەرەو ژوورکـــا
قـــەڵای زۆرداری خـــاش و خـــاپـووركــا

ئەی ئەو کـــەســـانەی، مـــەردانە مـــردن
مـــــایەی شـــــانازی درشــت و وردن!

ناوتان نیـــشـــانتـــان، بیـــرەوەریتـــان،
هـەتـا هـەتایـێ نەمــــرە، جـــــاویدان!!

مۆسکۆ / شوباتی ١٩٧٩

## باری ئەمڕۆی کوردستان
## (کڵۆڵی)

بێ باکم لێت سەرماو سۆڵە
شەرتە نەکەم پرتەو بۆڵە
هەرچەند رووت و قووت و برسیم
گیرۆدەی داوی بێ کەسیم،
بێ خان و مان و بێ ماڵم
چەندی بڵێی هێند بێ حاڵم
ئاردو ئازووقەی رۆژانەم
هیچی نەما رۆیی سەرجەم
وردیلە بچکۆلەکانم،
نازدارە بەرخۆلەکانم،
وەکو زەرنەقووتە دەمیان
داپچڕیوە بۆ پاروێ نان!
لەسایەی سەرکردەکانم،
سەرکردە تۆخ کوردەکانم!
زۆربەی شەوان زۆربەی رۆژان
لەگەڵ مۆزیقای دەستڕێژان!
دەست لەمل و گەردن دەکەین
رەقس و سەمای مردن دەکەین!

هەولێر / سەرەتای زستانی ١٩٩٥

## خۆزیا

(※) خــــۆزیا لاویّتـــــیم دەگـــەڕایەوەو پێم رادەگـــەیاند
کـــەپیـــری چی کــــرد چ نازارێکی بەگــیـــانم گـــەیاند!
بەلاّم لاویّتی هەرگـــیــــزاو هــەرگـــیـــز ناگـــەڕیّتــــەوە!
بەردیش کـــەبخــــزێ، تازە شــوێنی خــۆی ناگــریّتـــەوە
بۆیـە بێ گــومــان عــومــرت هەشــتــابێ، ئەوەد بێ ســـەدبێ
لەگـــــەشــــتی ژینا کــــارو کـــــردەوەت چابێ یا بەد بێ
رایەخی ژینت دەپێــچــیّــتــەوە بەبێ هەســت و خــوسـت
بێ مـــاڵئـــاوایی دەردەچی و دەڕۆی بۆ باوەش ســـــروشـت
ئەوەی ئـەمـــــر بێ ناوی پیـــــاوەتی و کــــاری بەکــــەڵکە
خــــزمـــــەتکردنی بێ ریـا کــــاری گـــەلانی خــــەڵکە

هەولێر: ١٩٩٥/١٢/٢٢

(※): ئەم تاکە شیعرە عەرەبی یەی خوارەوە بووبە مایەی دانانی ئەم چەند شیعرە کوردیەم:

(ألا لیت الشباب یعود یوما ※ فأخبره بما فعل المشیب)

## کۆمەڵێکی بەناونیشتمان پەروەر

کــــــۆمــــــەڵێ بەناو وەتەن پـەروەرن،
چوست و چالاک و شــێــرانی شـــەڕن

بۆ ڕەددی بەلاّی زەمـــــان ســـــوپەرن
خـــاوەن ئیـــــدراک و هـۆش و هونەرن

کـەچی مێ بازو مــەست و مــەی نۆشن
بلّح و تەمــبـــەڵ و بێ هۆش و گـــۆشن!

وەتەن پەروەرییان وەک دار عەسایێ
گرتۆتە دەست بۆ دەعیەو هەوایێ

ئەگینا بەکەس بەزەییان نایێ
وەتەن دەفرۆشن بە مەرحەبایێ

یا بەچەند پێکێ لەژەهراوی مەی،
لەکۆڕی بەزمی سەماو سازونەی!!

ئەگەر هەژارێ بۆ پارچەیێ نان
دەم پەل کاتەوە لەبەر یەک لەوان

دەڵێن چەند فلست هەیە لەگیرفان
بێنە بەشی کەین لەبەینی خۆمان

ئێمەش هەژارو رووت و برسینە،
بێ پارەو پوول و تەخت و کورسینە!

ناتوانن فلسێ دەن بەهەژارێ
بەڵام دەتوانن هەموو ئێوارێ

چەند قاپی نارەق بەرنە رووبارێ
چەشنی گوێدرێژی هەردەی بەهارێ

بیکەنە جەژن و سەیران و بەهار
بەبەستە گوتن و حەیران و قەتار!!

کۆیە: ١٩٤١

## هۆشی منی

نێشی منی، نۆشی منی
هێزی تەن و، تینی منی
هەستی منی، هۆشی منی
گیان و دڵ و، دینی منی

## خۆت هەڵمەکێشە

ئەگەر جوامێری و پەسندە کارت
خۆت هەڵمەکێشە بەکەس و کارت

ئیبراهیم خەلیل رەسووڵی چاک بوو
بەڵام باوکەکەی نیهاد ناپاک بوو

(لووت) پێغەمبەر بوو کەچی ژنەکەی
دەخیلت دەبم هەرباسی نەکەی!

کوڕی نووح بەقسەی باوکی خۆی نەکرد
نوقمی تۆفان بوو بەبێ کەسی مرد

أبو طالب و ئیمامی حەیدەر
جیاوزیان زۆرەو ناکرێن بەرامبەر

مەڵێ: فلانی کوڕی فلانم
بڵێ: گیانفیدای رێ ی نیشتمانم

بەهێزی خۆم و گشت فیداکاران
دەڕمێنین تەخت و قەڵای زۆرداران!

هەولێر: ١٩٩٥/٣/١١

## باری ژیانی کورد

کورد لەکۆتایی سەدەی بیستەما
لەدەس سیستێمی جەورو ستەما
وەک دانەوێڵەی دەوری دەستارن
بێ نۆقرمن ئاخو کەی دەیان هاڕن؟!

## سادیزم

لە(مسیۆساد) کۆنترە
دوای لێکتر چابوون، جاڵجاڵۆکەی مێ
نێرەکەی دەخوا
پیاوی واش هەیە، دوای لەژن تێربوون
دەی کوژێ و دەڕوا!!

*****

## ماچی دڵداری

لەدنیادا نییە خۆشتر، لەنەشئەی ماچی دڵداری
ئەهێنێ هەر مژیکی سەد قەڕابەی خەمری گوڵناری!

*****

## سوکی

لای پیاوی نامەرد سووکی ناسانە
برینی لەشی مردووبێ ژانە! (لەعەرەبی یەوە)

## بۆ شەهید عادل سەلیم

عادل سەلیمی نازاو تیکۆشەر
فیداکار لەرێی کارگەرو رەنجبەر
ناوت، کردەوەت، هەتا هەتایێ،
نەمرەو نامرێ قەت دوایی نایێ!

## دیسان بۆ عادل

کــاکــه عــــادل نەی عـــەزیزی عـــادیلان،
وێنەکەت نەخشە لەســەر سـەفحەی دڵان
کـــردەوەو ناوت دەمـــێـنێ تا زەمــــان،
بێـت و بـڕوا جــــاویدانە، جــــاویـدان

## هۆی کۆچی عادل سەلیم

بەهۆی نۆشـــینی فنجــانێ، لەژاراوی هــەلا هەل بوو،
کە کڵـێـەی ئاگـری مــردن، لـەسـنگی عــادیلا هـەڵ بوو!!

❊ ❊ ❊ ❊

## ڕەوتی ژیان

کێ بوو هـەتا ســــەر، ژیا بەشــــادی بە ئارەزووی دڵ؟
ســـەدان، هــەزاران، ئاوات و خــۆزگــەی نەبردە بن گڵ؟!

## شیعری فێرکردن
## سوودی سیر

ئەگـــەر دەزانی چەند بەکـــارە ســیـــر،
هـەرگـیــز خــواردنی دەرناکـەی لـەبیــر!
بۆ تەوژمـی خــوێن، بۆ رۆمـــاتیـــزم
بۆ کـەم کــردنەوەی ســەودای ســادیزم
بۆ پاک کــردنەوەی ریخــۆڵەو گـــەدە
دەرمـــانی چاکـــە لەدەســـتی مـــەدە
بۆ رشـــانەوەو زەحـیـــری و زگ چوون
بۆ کـرمـی گـەدەو بۆ سـیل و تاعـــوون
ســیــر دەرمـــانێکی کـاراو بە هێــزە
گـوشـــادی بەخش و شـــادی ئەنگێــزە!
ئارەزوو بـەخـش و دەمـــــار بـزوێـنـە،
نۆشـــدارویێکی زۆر ســەرســورمـێنە!
هـەرکـەس لەرازو ســڕی ســیـــر بگا،
هـەرگـــیـــــز ناتوانێ لـەیادی بکـا!

هەولێر: ١٩٩٥/٣/١١

## پێنووس

پێنووســـــەکـــەم شـــیـــفـــەرە،
بـــۆیـــە بـــێ بـــیـــنـــەو بـــەرە،
چەکی دەســــتـــی نووســـــەرە!!
خـــــەتی خـــــۆش و رەوانـە،
هـــەتـا بـڵـێ ی جـــــــــوانـە،
هـــــەردەم لـــــەبـــــەر دڵانـــــە!
کـــاتێ دنیـــا دەشـــــەقـــژێ
گـــرو کــــڵــــپـــــەی لێ دەپژێ،
وشـــــــــەی زێـڕی لــێ دەرژێ!

ستۆکهۆڵم: ١٩٩٢/١/٢١

## ژینی ژێر دەستی

ژینی ژێر دەستی بەڕاستی
مردنێکە سەربەخۆ!
مردنی ڕێ ی سەرفیرازی
ژینی ئەمرە بۆ مرۆ!!

****

شاعیرێکی کوردی سەربەرزو پەرێز پاکم ئەمن،
چقڵی چاوی دوژمنان و ڕەندوبێ باکم ئەمن.

****

## بۆ شیرینە چکۆلە

شیرینی زەردو لاوازم
خوشکە بچکۆلەی ئاوازم
کچی دڵزاری شاعیرم
هەر لەبنیادا ماهیرم
ئەمرۆ وردو کەم تەمەنم
بێ تەوژم و تینە تەنم
بەلام سبەی وەکو خەڵک
دەبمە کچێکی بەکەڵک!!
لەناو کۆمەڵ دیار دەبم
ئەندامێکی بەکاردەبم
هەر بەزانست بەهێز دەبم
پایەدارو بەرێز دەبم
زەرگی چاوی فاشیست دەبم
مەرگی ئیمپریالیست دەبم!!

١١٩٧١/١٢/٢٨

## شانسی کورد

وەکـــو ئاردێکە شـــانسی کـــورد
کـــــــەپەرتی ناو درک بووبێ
لـــەبـــەرتـــین و تـــەوژمـــی بـــا
دەبێ کـــۆکـــردنەوەی کـــووبێ؟!

(بیرەکەی لەعەرەبی یەوە وەرگیراوە)

## باوەڕی دیندارانی مەسیحی

دیندارانی مـــەســـیـــحی گـــشت
هـــەر لـــەوردیـــان هـــەتـــا درشـــت!
دەڵێن عـــیـــســـای کـــوڕی مـــەریەم
خـــــوایە لەبەرگی بنیـــــادەم

## هەنگ

پاک و پوخت و خـــــاڵدارە هەنگ
هـەتا بڵێ ی بەکـــــارە هەنگ
دەرمـــــانخـــانەی باڵدارە هەنگ!

## پاشی مەرگ

نامێنێ قەت پاشی مەرگ و لەش نمان
غـــەیری ناو و شـــوێنەوارو وێنەمـــان
با بمێنێ وێنەکـــــەم بۆ یادگـــــار
تا بسووڕێ چەرخی چەپگەردی زەمـــان!

******

شـــاگـوڵی گـوڵزاری ئامـــانج و ئومـێـدم هەرگـەشـــە
گـەرچی نیـــســـتـا دڵ لەدنیـــا و دیدەنیـــتـان بێ بەشـــە

*****

بەرامبەر رۆژی راستی، بەفری فریوو درۆ
دەبێ بەناو دەڕوا دۆڵ بەدۆڵ و جۆ بەجۆ

*****

ئیتر هەر پایەداربیت و بەرزبێ داێما جامت،
بەپەنجەی دانش و فامت، بقرتێنیت گوڵی کامت

*****

## دیتن و بیستن

محەممەد دیتن و موسا شنەوتن،
شنەوتن کەی دەگاتە ناستی دیتن؟! (لەفارسی یەوە)
منیش نێستا لاونیم
خورتێکی بەتاونیم
بۆیە لەبەر چاونیم!

*****

## ئافرەت

ئافرەت دایکە، خوشکە، دۆتە،
ئافرەت هاوسەر، هاوڕێ ی خۆتە!

## پیاوانی ئەمن

کێ دەڵێ پیاوانی بێ شەرمی ئەمن
نەختێ هیچ و تۆزێ پووچ و کەم کەمن؟!

سووتام، برژام، کوژرام، دولبەر
لێوت با لێوانم کا تەڕ
« انا اعطیناک الکوثر»

## ڕێ ی شەرەف

ڕێ ی شەرەف بەرنادەم و ڕێچکەی خیانەت ناگرم
بشمرم بۆ گیانی دوژمن تا هەتا هەر ناگرم!

پێک شکا، مەشروب ڕژا، مەی گێر نەما
هاودەمان کەسیان نەمان، پشتم چەما

## دووری پلۆتۆن

دووری زەوی لەخۆر چەندە؟
دووری پلۆتۆن چل ئەوەندە!!

دووفلووسی نابێ ئەوەی ئەمڕۆکە نەیبێ دووفلووس
گەرچی دانایێکی ئەوتۆ بێ لەچەشنی جا لەنووس

ساڵی ١٩٤٠/

وەکو شمشێری (دیمۆقلیس)ە سەدام
بەسەر سەرمانەوە هەر سوبح و هەرشام

## بۆ کاکە باسی مامەنداغا

ئای کەئەمڕۆ ڕۆژی ئاکۆ، چەندە تاریک و ڕەشە.
تامی مەی ئاوازی نەی، هەرگیز بەکەس نادا نەشە.
گەر لەدڵزاری دەپرسن ڕۆژی کۆچی کاکەباس
سی حوزەیرانی هەزارو نۆسەدو شەست و شەشە!

سەرەتای تەمووزی/١٩٦٦

## بۆ کاک نافیز جەلال

سەری بەرزی وەزیری گیانفیدای کورد
بەرزتر بوو لەقەندیل و لەهەڵگورد
هەتا کورد مابێ نافیز هەر دەمێنێ
لەناو دڵ دا دەژی باکەس نەڵێ مرد!

******

## نرخی مرۆڤ

ئەستووراییی دار، نازانرێ هەتا لەبن دا نەبڕێ
نرخی مرۆڤیش نازانرێ هەتا کۆچ نەکا نەمرێ!

******

بمکوژن خوێنرێژەکانم          چون لەمردنمایە مانم

حوسێنی مەنسوور حەللاج

## چاکەو لێبوردن

وەک داری بەردار بە تۆ
میوەت بهاوێژە بۆ،
هەرکەسێ کە بەردیشت
بگرێتە ناو لق و پۆ!!

******

هەچ کەسێ هیچ کەس نەناسێ کەس نییە
ماڵ و سامانی بەتەنیا بەس نییە

******

چل و پێنج ساڵی تووش و سەختی عومرم
بەسەربەرزی بەسەربردو بەهیوام
بژیم و هەردەژیم و نابێ بمرم
لەویژدانی گەلایە چونکە جێگام!

قەڵادزێ / ١٩٦٥/١/٨

## مەردی ئازا

مەردی ئازا ئەو کەسەیە
لەبەر ستەم خۆی راگرێ،
سووربێ لەسەر مافی رەوای
تاسەرکەوتن پێ ی داگری

## بۆ ئاورەحمانی مەحمووداغا

ئاورەحمانی مەحمووداغای حەوێزی
تۆ پیاوێکی خۆشەویست و بەرێزی
کەپێیت دەڵێن شێتە، لەتیژ بیریتە
لەبەر خێرا جواب دانەوەو ژیریتە!!
جگە لەمەش لای قەدرو قیمەت نەزان
شێتە مرۆی زیخ و زرنگ و زۆرزان
ئومێدی وایە سا (دلزار) بەمەردی
بژی بژی هەتا لەسەر، رووی عەردی

هەولێر: ١٩٦٤/١١/١٦

******

ئەنگە نەهی و نەفرین بکەی
لەنەریت و جۆرە خووێک،
ئەگەربێت و بەقەد مووێک
لەخودی خۆت دا شک ببەی!!

## مەل و ماسی

لەخەوتا گەر مەل و ماسی ببینی
لەشادی دا وەکو شای سەرزەمینی!

# پێکەنە

پێکەنە هەروەک گوڵاڵەی بەر بەیان
پێکەنە هەروەک ستارەی ئاسمان
پێکەنە قیبلەی ژیانم پێ کەنە
شارەگی روحم لەبن دا هەڵکەنە!

******

# شۆڕشی بەلقان لەدژی فاشی

لەناو کڵپەو گڕی شۆڕش
سەراپا نیشتەجێ ی بەلقان
بەکوڵ دەکوڵێ لەهەرلاوە
وەکو مەنجەڵ دەدا بڵقان
بەهاوکاری سوپای سووری
بەکاری قارەمان هەستان
بەجارێ تێک شکا پشتی،
شکا فاشستی بێ ویژدان!

کۆیە: ١٩٤٦

# پیاوی سووک

پیاوی سووک، سووکی، بەلاوە سووکە
چەندەی بێ نرخی بەلاوە بووکە!!

******

# ئێمەو ئێوە

ئێمە خشتی بنیات نان و
ئێوە پاچی رووخاندنن!
ئێمە ناواتی ژیان و
ئێوە مایەی مراندنن!
دڵ گەرم و سەر سارد
دەس پاکین ئێمە،
بۆ ژین لەمردن،
بێ باکین ئێمە!
سەرگەرم و دڵ سارد
نگریسن ئێوە!
بێ شەرت و پەیمان
دەس پیسن ئێوە!!

## ریفڕاندۆمی ئادار و
## ریفڕاندۆمی پایز

لــــە دوا جـــــــارا ، لـە ئـادارا ،
لــــەگـــــــەڵ پـرشـنـگـی بـەهـارا .
کـــــــــە ڕۆژی ئـازادی هـــەڵات ،
شـــەیـتـــانی شــــەڕ شکا هـەڵات !
ئەمـــەش باشـــتـــر ریفـــراندۆم بوو ،
زلـــتـــر زرمـــەی تۆپ و بـــۆم بوو .
بـۆ ئـــەویـــســـتن ، بـۆ تـێـکـدانـی ،
حـــوکـــمی پاشـــای دارســـتـــانی .
ئەو پاشـــایەی بە گـــفـــتی خـــۆی ،
بـە لـۆجـــــــیـکی بێ تـان و پـۆی .
زاتێـکی گـــــەورەو ڕەســـــەنە ،
ئەسـلی حـــوســـەین و حـــەســـەنە !
لـــقـــی داری ئـــبـــــــــــووەتـــە ،
بـۆیـە بـەهـێـــــــزو قـــــــووەتـە .
ئێـــدی مـــــەڵێن ســــەگی دڕ بوو ،
پیـــاو کـــوژ ، ڕێگر گـــیـــرفـــان بڕبوو.
شـــەڕ هـەڵگیـرسـێن و ئیـبـلیس بوو ،
زۆر ئـــزم و ئـــگـــریـــس و پـــیـــس بـــوو.
چـوار هـەزار دێـی وێران کـــــــردیـن،
ســـــەر و مـــــاڵی تاڵان کـــــردیـن .
دوو ســـەد هـەزار کـوردی کـوشـــتین .
خـــوێنی کـــوریەی ســـاوای ڕشـــتین .
ڕەوشـت و خـــووی خـــەرا کـــردین ،
حـــــــەیـای هـەزارانـی بـردیـن .
خـــــــاوەن زێـڕی زەرد و ڕەش بـوویـن ،

کەچی لە گشتی بێ بەش بووین .
لەگەڵ ئەمەشدا بێ دەنگ بین ،
لە ناست (زرپە) زمان لەنگ بین ؟
هەر سوپاسی دکتاتۆر کەین ،
چەکی بەندایەتی مۆر کەین .
با گەلانی دنیاش قڕکا ،
جیهان لە زۆر داری پڕکا .
کوێت ، ئێران با کوردستان ،
هەموی بکرێ بە گۆڕستان .
نەڵێن سەرۆکمان (کاکە جوان) !
گورگە لێمان بۆتە شوان ؟
لاشەی گەلەی گەلمان دەخوا ،
بە بێ باکی بەبێ پەروا !
نەڵێن ، نەڵێن هەرگیز نەڵێن ،
پیاوێکە بێ شەرت و بەڵێن .
شەیتانێکی بلیمەتە،
یاری لەسەر هەزار پەتە !
ڤایرۆس و میکرۆب دە چێنی ،
ملیۆنەهای پێ دەمرێنی .
هێشتا هەروا چەکی بەکار ،
دەکڕی بەزێر و بە دۆلار .
باڵا خانەی سەخت و بەرز ،
بە جوانترین شێوەو تەرز .
هەڵدەندرێ ،بڵند دەکرێ ،
بەرەو تاقی ئاسمان دەبرێ .
گرنگ نیە هەرچی بووە ،
گرنگ نیە هەرچی چووە !
با گەلیش رووت و برسی بێ ،

نوفـــــمی دەریای مـــــەترسی بێ !
قـــەیدی چیـــیـــە ســـەد هەزاران ،
مـــنـــداڵـــی ورد ، دەس بـــە داران !
پەرتی کـــــوچە و کـــــۆڵانان بن ،
ســـــواڵکەری پارچەیەک نان بن !
یان پتـــــر لە پێنج ســـــەد هەزار ،
کـــورپەی ســـاوای جـــوان و نازدار .
لەبەر بێ شـــیـــری و بێ خـــۆراک ،
بمرن و بخـــــرێنە بن خـــــاک !
بڵـــێن : ســـەرۆک تاقـــانەیە ،
پڵنگی بێـــــشـــــەو لانەیە !
(أم المعـــارک) شـــاهـیـــدە ،
ســـەرۆکـــمـــان تاکـــە قـــائیـــدە !
سی لەشکری دنیـــای شکاند ،
خـــوێنی شـــەرق و غـــەربی رژاند !
بۆیە بڵـــێن : ســـەرکـــەوتووە ،
بۆ ســـــەر لووتکەی بەرزی چووە !
نەی نابیـــنن ســـــەلامـــــەتە ،
ملی هێـــشـــتـــا دوور لە پەتە .
بـــەڵام ، بـــەڵام ئـــەو رۆژە دێ ،
بـــروا بـــکـــەن ئـــەو رۆژە دێ .
گـــەل راپەرێت و ســـەرۆکـــەوبێ ،
عـــەفلەقی گـــەل وەبەر کـــەوبێ .
دوایـی بێ تاریـکی شـــــــەوێ ،
رۆژی نـازادی دەرکـــــــــــەوێ .
بـــــروا دەوری دەربـــــەدەری ،
رۆژانـی پڕ کـــــــــوێرەوەری .

هەولێر : ٥و٦/١٢/١٩٩٥

## ژیان و مردن

هـــەر لـــە رۆژانـــێ ژیـــان پـــەیـــدایـــە ،
مـــــــردن لـە دژیـا لـە هـەڵپـــــە دایـە .

گـــەرەکـــیـــــە ریـشـــەو رەگـی دەرێـنـی ،
گـــــــەڵای زیـنـدەگـی لـێ هـەڵـوەرێـنـێ .

ســوپـای مـلـیـۆنـان مـیکرۆب و ڤـایرۆس ،
دەکـوژێـنـێـتـەوە لـە مـێـشـکـا فـانـۆس !

چـەکی ناووکی و کـیـــمـــیـــایـی بەکـــار ،
رەنجـی مـلـیـــۆنان دەدا بـە خـــەســـار .

## دەدەک

لـە شـــیـــری مـــەڕ و مـــانگا چەورتر ، شـــیـــری دەدەکــە ،
دەدەک گـامـێـشـی مـێـیـە بەراسـتی سـودی گـەلەکـە .

قـەیماغ و مـاسـت و پـەنیـری ئێـجگار بە تام و خـۆشـــە ،
داگـیـــرســـێـنـەری چـرای ئاوەزو ئـەندێـشـــە و هۆشـــە .

دەدەک پەیداکەن ، دەدەک بەخـێوکەن لە کوردسـتـانا ،
لـە شـــارەزوور و دەشـــتی بێـتـوین و دەربەنـدیخـــانا .

## ماوەی ژیان

ئەسپی رەش و سپی زەمان
هەڵمان دەگرێ بەرەو ئەمان

بەلام ئەوەی بۆ گەل ژیا
با خاترجەم بێ دڵنیا

هەر جاویدانە ، زۆر هەژی
هەتا دنیا ماوە دەژی

## بۆ کچە گۆرانیبێژێکی لاو

مەمکی خڕی وەک مانجەیە ،
دەنگی دەمەنی کەمانجەیە !

باڵای بەرز و گەردەن قازە ،
چاوی هەروەک چاوی بازە .

مووژەی تیرە ، ئەبروی کەوان ،
لێوی نۆشی رۆحی ڕەوان !

(ئەناهید)ی سەر ڕوویی ئەرزە
کڕنووش بۆ بردنی فەرزە

## دوو بەیتی

سـبـەینان زوو چریکەی بولبـولانە
بـەیـادی رویـی پـڕ نـوری گـولانـە

لە ئاهی من فـەلـەک ئاخـر حـەزەر کـە
ئەسـەر لـە نالـەیی سـووتـە دلانە

(بابا تاهیری هەمەدانی)

موفتی زەهاوی لە بارەی (خود) ەوە لە پارچە شعرێکی عەرەبیدا دەڵی:

لەناوێنەدا پیـرێک بەدەر کـەوت ،
تەمـەن درێژ و خـاوەن ئەزمـوون بوو .
پێـمگـوت : چـەنـد ژیـایـی؟
گـوتـی : نـەوەد سـاڵ .
گـوتم : چ فـێـربووی ؟
گـوتی : خـواردن و خـلـتـە فـرێدان ،
خـواردنەوەو مـیـز و ئارەقـە دەردان .
بـەرگـی نایـاب و نوێ لـەبـەر کـردن ،
پۆشـاکی کـۆنە و وڕجـڕ داکـەندن .

## بۆ کاروانی جوانە مەرگ

لـە نۆزدەی شـەشـی دوو هـەزار و سـێ
لاوی هـوشـیـاری زۆر بـەڕێ و جـێ

کـاروانی فـەرەیدونی حـەوێزی
بۆ هـەتا هـەتا ، خـەوت لـە ئامـێـزی :

خـاکـەکـەی کۆیـەی ، جـەرگی کوردسـتـان
بێـشـکـەی هـونەر و زێـدی زانـایـان

دەرچووی کـــۆلیــــجی زانسـت بوو دانا
لــە ڕێی هــاتو چـوی ژیـن ســـــــەری دانا

ئەمـــــری بۆ گـــیـــــانی پیــــرۆز و پاکی
بـۆ ئاو وکـــــــردەو ڕەوشـــــــتی چاکی

کۆیە : ٢٠٠٣/٦/٢٢

## تاک

ئەو کــۆچکردووەی گــەل بۆی نەگــرێی ،
مــێــژوو قــەت و قــەت بۆی پێناکـەنی ،

## لە پرسەی هاورێ (ئەحمەد عەوێنە) دا

ئەحـمــەد عـەوێنەی هـاوڕێ و هـاوسـەنگەر
کــــادیری دیاری ، ئازا و تـێکۆشـــــەر

پتـــــر لـە چـل ســـــاڵ ، لـە زۆر بووارا
تێکۆشــــا لـە شــاخ لە گــوند و شـــارا

ئـازار و ئـەرک و دەردەســـــــــــەری دی
تـاڵـی غـــــــــوربـەت و دەربـەدەری دی

هـەتا لـە چواردەی ، مــانگی نیـســـانی
دوو هـەزار و یـەک دوور لـە خـــزمـــانی

لـە خــاکی ســـوێد ، پەپولـەی گــیــانی
لـە نـاکـــــاو فــــڕی بـۆ جـــاویـدانی

هـەزاران درووود لـە گـــــیــــــانی پاکی
لـە خــــوو خـــدە و کـــرداری چـاکی

هەولێر / ٢٠٠١/٤/٢٩

## مێژووی لە سێدارەدانی پێشەوا

سـالّی هەزار و نۆ سەد و چل و حەوت بوو سی نادار ،
کە شا پەرستان پێشەوای گەورەی کوردیان دا لە دار .

## شیعر

شیعر پرتەوی سەرچاوەی نوورە ،
بروسکەی وزەی هەست و شعوورە !

ئەگەر بە توندی ڕات نە چلّە کێنی ،
لە بێخ و بنجا دات ئەگیرسێنی .

کۆمەلّی وشەی بی تین و تەوە ،
هیچ فڕی نییە بەسەر شیعرەوە .

## خوێن ڕێژ

ئەرێ سنگ شێری پووشتی ماکەر پشت ،
پێم نالّێی خوێنی ئەم خەلّکەت بۆ ڕشت !؟

## لە هەر باخێ گولێک

وەستاوی بەلاّم هەر کەس بوەستێ بی شک مردووە ،
دەلّێی لە پێلّوی چاوی مەرگدای ئەویش نوستوە !

«موتەنەبی»

سەیری روح زلی ئەوانەی دووجار
بە ڕۆگەی میزا هاتونەتە خوار

عەلی کوری ئەبو تالیب

* ترس شـــيـــرەكـــەی دەتوێنێـــتـــەوە
گـــەر كـــالان نـەبێ دەچۆڕێتـــەوە

(موعەڕی)

بەســـەر روتا زولف قـــەف قـــە ف ڕژاوە
كـــەوا ســـومـــبـــول بە گـــوڵ تێكەڵ كـــراوە
پەرێشـــان چۆن نەكـــەی تۆ تاری زولفـــان
بـەهـەر تـاری دڵـێ هـەڵـواســـراوە

«بابا تاهیری هەمەدانی»

مـن ئـەوەم كـــە خـــۆشـم دەوێ ،
ئـەوەی خـــۆشـم دەوێ مـنـە !
نێـــمـــە دوو گـــیـــانین و بەڵام ،
وایـن لـە نـاو یـەک تـاكـــە تـەنـا !

حەللاج

دوو باسک و دوو شـــیـــر و دو مـــەردی دڵێـــر
یەكـێک ئەژدەها و یەكـێک نێـــرە شـــێـــر

«فیردەوسی»

كـــەتۆ لـە دەردی خـــەڵكی بێ غـــەمـی
هـەق نـیـــیـــە ناوت بـنێن نـادەمـی

سەعدی شیرازی

لـــە نـــاو دەریـــادا ، دڵـــۆپ دەریـــایـــە
دەنـــا دڵـــۆپـــە و دەریـــاش دەریـــایـــە

جەلالە دینی رۆمی

هـەزار بریا دەمی تێكرای كـچـانی جـوانی دنیـایە
دمێ بوایە و بە كـامی دڵ ئەمـن مـاچم بكردبایە

بایرۆن

تۆبە کەم قوربان لە خۆشەویستنت تا سەر نیە
خوا چ کەس نەگرێ جگە لەو عاشقەی تۆ بە دەکا

ئیبن زەیدون

بیتهۆڤن دەڵێ / دەبێ موزیکا ،
ئاگر لە گیانی مرۆڤ هەڵبکا !

بیتهۆڤن

لە منداڵیما چەند باوەڕێکیان
ئاخنیە مێشکم دوور لە فەهم بوون
دوایی دەرکەوت کە تێگەیشتم .
سەرجەم ئەمانە تەنیا وەهم بوون

ڕەسافی

مەتەڵی ژیان و واق وڕمانی هۆش ،
بوونی بیرە بە چنگێ لە خۆڵەمێش !

جەواهیری

## پردی ژیان

بەسەر پردی ژیانا دەستە بە دەستە ئینسان ،
هەتا هەتایە دێت و گوزەر دەکا بێ وچان !

پردێکی سەر سوڕمێن و سەیرە لەسەر دوو پایە :
بەندە کە بنکی هەردوو لە ئاخی هیچیایە !

لە بەینی دوو نەبووندا ، ماوەی ژیان دیارە ،
خەبات و خۆشەویستی و ئومێد و ئیش و کارە .

دڵزار

ئەگـــــەر یاری منت بینی لە خـــــڵـــــوەت ،
بڵێ ئەی بێ وەفـــــا ئەی بێ مـــــرووەت ،
یەخـــــەم وخجـــــڕ بە وخجـــــڕ بوو لە دەســـــتت ،
کـــە قـــەت نایدۆزمـــەوە تاکـــو قـــیـــامـــەت !

بابا تاهیری هەمەدانی

بە کـــــامی دڵی مـن نەیەتە جـــــەواب ،
من و گـــورز و مـــەیدان و ئەفـــراســـیـــاب !

فیردەوسی

لەنەی بشنەوە چۆن حـــــیکایەت دەکـــــا ،
لە دەســـــتی جـــــودایی شکایەت دەکـــــا !

جەلالەدینی رۆمی

خـــوایە ســـامـــان و مـــڵکت ســـەند لە من ،
داتە ئەو کـــــەســـــەی نە پیـــــاوە نە ژن !

لوتفعەلی خانی زەند

نامـــە نانوسم نەوەک ئاگـــای لە ڕازی ئێـــمـــە بێ ،
دوو زمـانێ وەک قـەڵەم یان ڕوورەشێکی وەک وەرەق !

موفتی زەهاوی / لەفارسییەوە

قـــەومی من هەمـــوو ســـەرن زۆر مـــومـــتـــاز ،
ئـاخـــــۆ ئەتدیوە چاندنگەی پیـــــاز ؟!

عەلی حلی

بێ تۆ ئەی گیانی جیهان با دڵی خوێنینت چ بکەم ؟
تۆ کـــە بێ چاوی ئەرێ چاوی جـــیـــهـــان بین چ بکەم ؟
چاوەکـــانت کـــە لە پێـــڵـــو دەرەهێنن بێ گـــوناه ،
چاوی من کـــوێر بێ بڵێ جـــا منی مـــسکین چ بکەم ٭؟

خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی

٭ کاتی کە لە لایەن دەسەلاتی (شاسەفی) سەفەوییەوە
خەبەری دەرهێنانی هەر دوو چاوی (سورخاب خان) ی کوڕی پێ دەگات .

جیهان جامە ، فەلەک مەی گێڕ ئەجەل مەی ،
خەڵک دەیخواتەوە سەرجەم پەیا پەی !

جامی

ئەهێنی لەناو بەندی دڵمدا هەمیشە دیلە !
دوو لێوم قوفل و زمانی وریام تاکە کلیلە !

دڵزار

بە قوڵ بەسراوی خستیە دەریاوە ،
پێی گوت : قەت نەکەی ، نەکەی تەڕ ببیت ؟!

حەللاج

حاشا کە من لە مەوسمی گوڵ تەرکی مەی بکەم
لافی ژیری کە لێدەدەم ئەم کارە کەی بکەم؟
موتریب لە کوێیە بەرهەمی زوهد و دانشم
تەسلیم بە کەناری ئاواز و عود و نەی بکەم

حافزی شیرازی

ئەی موغ بەچەی زەمان پێم بدە جامێ مەیم
کە من لە کێشەی سونی و شیعە دا نیم
پێمدەڵێن (جامی) لەسەر کامە رێبازی
سوپاس نە سەگی شیعی و نە کەری سونیم

عبد الرحمن جامی

# بۆ میر عەزەب

ئەو حوکمەی دەیکەی بە ویستی خۆتە ،
نەک بە ویستی گەل .
دە هەرچی دەیکەی بیکە با کەسیش
نەشی بڵی : لەل .
هەتا رۆژت دێ، هەتا خپ دەکرێی
ئەی ژانی ژیان .
بازۆ نەرمانە ، وڵات وێرانە
بۆتە گۆڕستان !

دلزار
هەولێر ٢٠٠٠/٨/٢٥

ها کا زانیتان میر غەزەب تۆپی،
لە هەموو لایی کرا بە چۆپی.

# جەژن و ئازادی

لە سایەی مەرگی بی دادی ،
وڵات رەنگین و ناوایە .

هەموو دەم جەژن و ناهەنگی،
بە جۆشی بووک و زاوایە.

## چوارکانی

ناخۆ دەزانن لەهەر سەرێکدا ،
چوار کانی هەیە لە پاڵی یەکدا!؟

یەک ترشە ، یەک تاڵ یەک سوێر یەک شیرین ،
قەت وشک نابن بە درێژایی ژین ؟!

## بۆ سەر گڵکۆی هاورێم عەبدولڕەحمانی مەحموود ئاغا

خەوتووی ئەبەدی ئەم ئارامگایە،
عەبدولڕەحمانی مەحموود ئاغایە.

حەوێزی زادە ، ئەوەی ئەختەر بوو
بۆ گەل و هۆزی زۆر غەم لەبەر بوو .

بە توێکڵ سادە ، بەڵام بە کاکڵ ،
هەتا حەز بکەن ، دانا بوو ئاقڵ !

مەردو ئان بدەو بەرچاو ڕووناک بوو ،
ڕەند و ڕووخۆش و دەست و دڵ پاک بوو .
دۆستی هەژار و لێ قەوماوان بوو
کردەوەی چاکی لەبەر چاوان بوو

لە پازدەی دوازدەی دوو هەزار و سێ
کۆچی دوایی کرد ، بێ دەنگ لە ناو جێ

هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی
ئەمری بۆ یاد و کردەوەی چاکی

## بۆ هاوڕێ زیرەک کەمال

* * *

هـــاوڕێ فـــــــــــــاروقـــی زیـــرەک و زانـــا ،
لـە ڕێگەی گـــەل وریێی نیـــشـــتـــیـــمـــانا.

ســـــامـــــان وتـمـــــەن تێـن و توانـا ،
هـەرچـی هـەمــــان بـوو هـەمــــوویـان دانـا .

لەگـــەڵ ئـەمـــەشـــدا ، شـــاد و دڵـنیـــاین ،
قـــــەت وا تێـنـەگـــەی بێ پـشـت و پـەنـایـن .

ئێــــمــــە لـە جـــــەوری دوژمـن بێ پـەروایـن ،
خـــاوەنی عـــەزم و نیــــمـــان و بڕوایـن .

١٩٩٩

## جورجی دوو پێ

لــە ســــێـــــزدەی دوازدەی دوو هــەزار و سێ
جــــورجـی دوو پێـــیـــان لـە کــــون دەرهێـنـا

گـــــرتـنی ســــــەدام بـۆ شـــــار و لادێ
مـــــــــــژدەی ئـازادی ژیـانـی هـێـنـا

٢٠٠٣/١٢/١٣

ژیان بۆ ئێـــوە ســـەر شـــۆری و نـەمـــان ،
بـۆ دوژمـنـانـی کـــورد و کـــوردســـتـــان .

*

## بۆ هاورێم سابیری عەزیز ئاغای دزەیی

* * * *

ســــابیـــری عـــەزیز ئاغـــای دزەیی
هـــەژار پـــەروەرو دڵ پـــڕ بـــەزەیـــی

شــــــەشی نـایاری دوو هـەزار و سـێ
لـە هـەولێـــرەوە بۆ خـــولـد کـــەوتە رێ

دۆســـــتی دڵســــــۆزی مـنـی دلـزار بوو
هـەتـا ئەو رۆژەی رۆژی لـێـــــتـــــار بوو

ســـــــــڵاو لـە نـاوو نـاو بـانـگی چـاکی
لـەســــــەر بڵـنـدی و ئاکــــاری پاکی

## سەرەتای پیری

مـــووی ســـپی هـات و بەناوەندی ســـەرمـــدا تێــپــەڕی
بۆیـە قـــاژووی بـەخـــتــیـــاری مـن بە ناچاری فـــڕی

## خوێنەری بەرێز :

مەلا عەبدولڕەحمانی راجی مەلایێکی شاعیر و کورد پەروەر و فرە روح سووک و نوکتەباز بوو شیعری زۆری بەسەر کوردستاندا هەڵدا بوو دۆستێکی نزیکی مامۆستا مەلا محەمەدی دلاوەریش بوو ناو بە ناو لە سالانی چلی سەدەی رابوردوودا کە ماڵمان لەسەر باغی (شەمە) بوو سەردانیان دەکردم سالی ١٩٤١ هەندێ شیعری خۆم بۆ هەردوو مامۆستا دلاوەر و راجی دەخوێندەوەو رایان لێ بوو، بۆیە مەلاراجی هەلبەستێکی جوانی بۆ نووسیم و دایە دەستم ، کەچی بەداخەوە ئەو هەڵبەستەش لەگەڵ هەموو شیعرەکانمدا لە شوباتی رەشی ١٩٦٣ دا سوتا و بوو بە خۆڵە سپی و تەنیا ئەم سی بەیتەم لە بیر ماوە لێرەدا دەیاننوسم و بە هیوام رۆژی لە رۆژان تێکرای چامەکە بدۆزینەوە .

بە برێکە ، هۆژە برێکە لە مـــــــەیدانی ئەدەبدا
بەڵکو ئەتەوەی ئازەر و ئەسکەندەرە دلـزار

چیـــمە لە شکســـپـیـــر و لە راسین و لە گۆتە
گــــەنجـــینەیی کــــوردانە کــــە دەرهێنەرە دلزار

(راجی) تۆ بلێ نوری دوو چاوو دڵ و گـــــیــــــانە
هـاوبیــــــری مـن و کــــــورد و ئەدەب پەروەرە دلـزار

١٩٤١ (راجی)

## لە چلەی کۆچی دوایی ئازاد شەوقی دا

ۆ چلەی کۆچی هونەرمەند پرسە نامەیەکم نوسی و
ـە کۆتایی دا ئەو چەندە دێرەشم نووسی

* * *

ئەگەر دەپرسن لە مێژووی چوونی
لە رۆژی رەشی لەپڕون بوونی

دەی ئابی سالّی دوو هەزار و دوو
ئەستێرەی ئازاد شەوقی ئاوا بوو

بەلاّم تابلۆیە هونەریەکانی
رەوشتی بەرز و ناو و نیشانی

دەمێنن لە ناو دلّی هەموان
تاکورد بمێنی هەر جاویدانن

ناوەڕاستی ئەیلولی ٢٠٠٢

## بۆ کارەساتەکەی باداوە
## کە لە ١٩٩٩/٨/١٧ روویدا

ئەی کابرای سەرشێت ، هەرزەی چەک لە مشت
پێم نالێی خوێنی ئەم خەلکەت بۆ ڕشت ؟!
کی گۆشی کردی ، کی پێی گەیاندی
کی دەرسی دادای ، کی تێی گەیاندی .
ئەم هەموو خوشک و کورە لاوانە ،
ئەم دایکە پاک و دور لە تاوانە ،
شەلالی خوێن کەی ، هەر بەنارەزوو ،
تفوو لە چارەو ناکارت تفوو !
ئەگەر تۆ سقالێک پیاوەتیت بووبا !
ئەگەر ناکارت لە ئینسان چووبا !
بۆ مشتێ پارەی دوژمنی ناپاک ،
خوێنی ئەم خەلکەت نەدرشتە خاک .
خوێنی کی ؟ خوێنی مەجیدو دارا ،
خوێنی (دلسۆز) و (شیلان) و دانا
(مەیاس) ی دایک و (شەو بۆ) ی شۆخ و شەنگ
بۆمالێیان بکرێ بەمیدانی جەنگ
(سەمیرە) و (دلدار) بۆ رۆژیان رەش بێ
باجیان کوفارەی خوێناوی گەش بێ ؟
کی فەرمانی دا بە گوللە باران ،
بەبان درین و ناگر تێبەردان ؟
تەنانەت بەچکەی وردو (ئاولەمە) ش،
بوو بە قوربانی قین و خەشی رەش !
ناخۆ ئەو هەموو هەتیوو ژنە ،
کەلە سەد لاوە جەرگیان کون کونە .
لە لایەن حوکمی خوێش و خزمەوە

لە لایەن دادی فیدرالیزمەوە .
دەبێ دوا گفتو بڕیاریان چی بێ ؟
بەری دادوەری و کرداریان چی بێ ؟
ئێمە دەمرین و مێژوو نامری ،
حەزدەکەین دادی کورد تۆمار کری ،
مێژوو نەفرینمان هەتا لێ نەکە ،
کۆمەڵگای گەلان پشتمان تێنەکا ،
دەبێ دادی کورد ، شوێنی خۆی بگری .
پاشا گەردانی دوایی پێ بدرێ .
پرسەم بۆ باوکی دارای شەهیدە
بۆ کەس و کاری کاکە مەجیدە
بۆ حزبێک کەوا شەست و پێنج ساڵە ،
لە خەباتایەو ئالاکەی ئاڵە !
بۆ گیانی ئێوەش هەزاران سڵاو ،
ئەی شەهیدانی بەناهەق کوژراو

١٩٩٩/٨/٣١

## رووبار

رووبار نییە رووبار ئەگەر
ئاوەڕۆی لە بەردی رەقا
هەڵنەکەنێ
کوردیش ئەگەر کورد بی دەبی
مافی و رەوای لە هەر هەموو
داگیر کەرانی بسەنێ

* * *

نابی هەدادانی هەبی
هەتا ئاڵای سەر بەخۆیی
خۆی هەڵدەکا
هەتا هەموو پیلانێکی
داگیرکەران پووچەڵدەکا

# دوو شێخ و شێتێک

هەشتی مایسی ساڵی دوو هەزار
سێ دۆست هاتنە لام دۆستی وەفادار

شێخێک . شێخ زادێک . شێتێکی دڵسۆز
کە ئاقڵتر بوو لە ئاقڵانی هۆز

عبدالرحمانە شا گوڵی سەر چڵ
بە تویکڵ شێت و بەکاکڵ ئاقڵ

شێتێکە بەڵام ئاژەڵی دووپێ
دەباتە سەر ئاو ئاوی ئادایێ

بە پەندی باش و بە ئامۆژگاری
ڕێبوار دەخاتە سەر ڕێی ڕزگاری

کاشکی خزمانم ، سەرجەم هەموویان
وەک شێتە دەبوو ڕەوشت و خوویان

کەسایەتی وازیرەک و زانا
شایانە بژی لەناو دڵمانا

هەولێر : ٢٠٠٠/٥/٩

شێخ حەمیدو سالارو عبدالرحمانی مەحمود ئاغا بوون .

## بۆ شێخ سالاری شێخ حەمیدی بەرزنجی

هەمیسان شاری کۆیە بەرگی شین و ماتەمی پۆشی
کەشێخ سالاری بەرزنجی پیاڵەی مردنی نۆشی

وەلێ سالاری رووخۆش و بەهۆش و زیرەک و زانا
بەلەش رۆیی بەرۆح نەژیێ لەناو ویژدان و دڵمانا

جوامێرێکی تا حەزکەن بەلوتف و عەتف و هێمن بوو
لەبۆیە شوێنی ئەو هەردەم لەناو چاوو دڵی من بوو

لەچواری دوو، لەساڵی دوو هەزارو سێ بوو کاک سالار
بەرەو خولدی بەرین رۆیشت و جێی هێشتین کزو غەمبار

ئەمەنەر بێ ناوو کرداری هەتا چەرخی فەلەک ماوە
لەپاش مردن ئەوەی ئەرواو بمێنێ کردەوەو ناوە

شوباتی/ ۲۰۰۳

«١»
# خۆری نەورۆز

دەوری کــــــۆن وەک بـەرگی پایـز زەردوژکـــــا هـەڵوەری
حــــوکـــمی نازی چوو نەمـــا زولم و زیانی قـــەیســـــەری
هەربژی گـیـانی حـەقـیـقـەت، هێـزی مـیللـەت پەروەری
«نیگبـەت و دیلی بەسـەرچوو فـەسلی کـۆن بوو تێـپـەڕی
عـــالەمــێکی تر لەرێی ئینســـانیــیــەت قــۆناغ ئەکــات

❊ ❊ ❊

کۆمـەڵ و گەل گـەل کـەنیـشکی شــۆخ و شـەنگی لالە روو
وەک کـــــەوو کــــۆتر بەدەم هـەردان دەهێـنە هـات وچوو
رۆژی دڵـخـــــــوازی بـەدی دێ، هـەرچی دڵ کـــــا ئارەزوو
«رووی زەوی پێـــچـــەی خـــەمی لاداوە خـــەمـــلاوە وەکـــوو
بووکی نەورۆز خـۆی لەبۆ شـــادی دەکـا بەخش و خـەڵات»

❊ ❊ ❊

هـەیکەلی ســـەرمـــا لـەگـــرمــەی هەوری نەورۆز راچەنی
گـیـاو چەمـەن مـافـوری راخـست، مـێـر غـوزارانی تەنی
بولبـــولی شـــەیدا کــە گـــریا خـــونچـــە پڕ دەم پێکەنی
«گـــیـــان لـەبەر تاکـــو نەباتیش کـــۆتی دیلی داکـــەنی
بـەرگی تازەی کـــــردەبەر، عـــــالـەم بـەرەو ئازادی هـات»

❊ ❊ ❊

«١» – لەســالی ١٩٤٦ لەکۆیە هـەڵبـەسـتێکی هاوڕێی دێرینم، (کاک عـوسـمـان مـسـتـەفا خۆشاو)م کردە پێنج خشتەکی و بەداخەوە هەر ئەو سێ کۆپلەیەمان دەسکەوتەوە

دڵزار

# تاکە تاکە

گەردی گەردانەی ، گەردنی (گەردان)
شایانە بکری بە سوورمەی چاوان !

.

هەتا خۆر هەڵی هەتا ئاوابێ،
ماڵی (فەرەیدوون) با هەر ئاوابێ ،*

تەمەن هەرچەند درێژ بێ کورتە بەخوا
وەک خەونێک خێرا دێت و دەڕوا

تفو سەد جار تفو ئەی چەرخی چەپگەرد
کە پیاوی مەرد دەکەی موحتاجی نامەرد

یازدەی یازدەی هەزارو نۆسەدو نەوەت و نۆ
ئاڵای فیدرالی کوردان شەکایەوە لە ئاسۆ

١٩٩/١١/١١

* (فەرەیدوون)ی برازام

## پیری

پیری کەهات لەگەڵ خۆیا،
تامی تاڵی مردن دێنێ.
بەڵام مردن کاتێک کەهات
ئەو تامی تاڵییە نامێنێ

*

خەوی بێخەمی ئەبەدی
لە باوەشی زەوی دایکا
دادەگرێ بەبێ ئەوەی ،
ببڕای ببڕنایووایکا !

*

ئێمەی زیندوش لە کاتێکا
خۆشەویستێک ئۆغر دەکا
سۆزی دەرون چاوودڵمان
پڕ لە ئاو و ئاگر دەکا

*

جا هاوڕێیان با بەر لەوەی
خۆشەویستێک بە هەژاری
جێمان بێڵی و هەتا هەتا ،
نەگەینەوە بەدیداری .

*

دەبا ڕێزی لێبنێین و
هێندە بێ هۆش و هەست نەبین ،
هاوکاراغان با دڵخۆش کەین
چیدی مردوو پەرست نەبین .

هەولێر :٢٠٠١/٢/١٨

## لەسەر گڵکۆی بارزانی نەمردا

لەسەر تابلۆی تەویڵی
زێدەزلی زەمانا
ناوت بە پرشنگی خۆر
نووسراوە ئەی بارزانی
نمایانەکاری تۆ ،
هێزرایە ئاکاری تۆ
کاریگەریت تا هەتا
لە باوە ئەی بارزانی

١٩٩٩/٧/٦

## ئامۆژگاریەک بۆ لاوان

برام تا کارای تاجی سەر سەریت
هەرکە پەکت کەوت چەورەو سەرسەریت
کەواتە کاکە، ئاگات لە خۆبێ ،
هۆش و ئەندێشەت هەمیشە کۆبێ،
هەتاکو نەگلێی نەهێنی نسکۆ
نەکەی ژیناوت بڕوا بەفیڕۆ
هێزی پیاوەتی و لەنگەری ژیریت ،
بپارێزە تا دوا پلەی پیریت

١٩٩/٧/٢٨

## عەزازیلی

عـــــەزازیـلـی شـــــەڕو ئاشـــــووب و مـــــردن ،
لـە پاش ســـــڕ بوون گـــەڕاوە جــــوولّە کـــردن
خـــــەریکە هـەڵبگیـــرسـێنی هەمـــیـــســـان ،
شـــــەڕی نگریسی پیـــسی کـــورد بە کـــوشـــتــدان.
لـە بۆیـە وا بـەگـــــــوڕ کـــــــەوتۆتـە هـەڵپـــــــە
خـــــــەریک دۆزینـەوەی یـەک تاکـــــە پـەڵپـــــە
ئومــــــێـــــــدم وایـە ئـەم هـەوڵـەش ئـەزۆک بی
لـەســـــەر ئاشـــــتی گـــەلی کـــورد ڕێک و کـــۆک بی

هەولێر : ١٩٩٩/٩/١٣

## شەڕی دوو بووک

(گـــەردان) شــۆخــێکی جــوان و قــەشـــەنگە ،
ڕەنگی ســـــــەر گـــــــۆنای ڕەنگی پەڕەنگە !
لـەگـــــەڵ (ئاهـەنگ) ی چاو جـــــوانا ئاخــــــر،
بۆچی هـەمـــــیـــــشـــــە لـە شــــــەڕو جـــــەنگە؟
بەڕاســـــتی ســـــەیرە ئەم شـــــەنگ و شـــــۆڕە ،
هـــەواو هـــەوەسی ،هـەر شـــــــــەڕو شـــــــــۆڕە !
(قـــــومـــــری) خـــوشکەزام کــــەوەک داکـــیـــــانە،
گـــــیـــــــرۆدەی داوی بی باکـــــیــــــــیـــــانە .
مـن کـــــە مـــــامـــــیـــــانم دەخـــــوازم لـە خـــــوا
کــــــــــــەبەم زووانـە بـگـەن بـە هـیـــــــــوا
هـاوســـــــــــەری ئاهـەنگ لـە زیـنـدان دەرچێ ،
غـــــــــــەمـــــــــــو تالاوی دووری بەســـــــــەر چێ .
گـــــــەردان بۆ ســــــــوێـد بڕوات و (ئاهـەنگ) ،
لـە گـــــەڵ هـاوســــــەریا ، بگێـــــڕی ئاهـەنگ .
ئەوســـــــــــا کـــــــــــۆتـایی بە ئاکـــــــــۆکی دێ .
خـــــــۆری ئاســـــــایش لـە ئاســـــــۆ هـەڵدی !
دلّـزاریـش دڵی دەحـــــــەســـــــێـــــــتـــــــەوە .
فـــــریشـــــتـــــەی شـــیـــــعـــــری دەگـــــەڕێتـــــەوە

دیمەشق : ١٩٩٩/٣/١٥

# گەنجینە

## بەشێکە لە چوارینەکانی
## بابا تایەری هەمەدانی

دڵزار
کردوویەتی بە سۆرانی

(( لەم ساڵانەی دواییدا بویژێکی هەڵکەوتوو ، هاوڕێ ئەحمەد دڵزار ، پێویستێکی نێجگار گرنگی جێبەجێکرد ، لە مێژووی ئەتەوەکەماندا و سودێکی زۆری گەیاند بە مێژوو ویژەی کوردی ، بە گۆڕینی بەشێک لە چوارخشتەکییەکانی بابا تاهیری هەمەدانی ، لە زاراوەی لوڕییەوە بۆ زاراوەی سۆرانی ، بەمە ئەتوانم بڵێم بابا تاهیری بویژی هەرە گەورە و کۆنی کوردی ژیاندەوە ، هەر وەکو یارمەتی بۆیژ و مێژوونووسانی کوردیدا لە پێناوی ناسینی یەکەم بویژی گەلی کورد ، کە بە زاراوەی لوڕی نووسیویەتی .

لە بارەی هونەرمەندییەوە ، هیچ کەموکوورتییەک لە وەرگێڕانەکەی هاوڕێ دڵزارا نابینم ، چونکە بە هیچ جۆرێک لای نەداوە لە واتەی چوارخشتەکییەکانی ، بەڵکو بە نزیکی هێشتوونیەتەوە لە لوڕی . تاقە هیوامان ئەوەیە کە کاک دڵزاری کۆڵنەدەر ، هەموو دیوانەکەی بابا تاهیرمان بۆ وەرکێڕێتە سەر شێوەی سۆرانی )) .

د. كامیل حسن بصیر
سلێمانی ٩/ ٧/ ٢٩٦٠

## سەرەتا

لە سەرەتایی شوباتی ساڵی ١٩٥٧ دا ، دانەیەکم لە دیوانە تازە چاپکراوەکەی ( بابا تاهیری هەمەدانی ) دەسکەوت و زۆر بە تاسەوە کەوتمە سەر خوێندنەوەی دیوانەکە لە تاران لەسەر کاغەزێکی زۆر نایابی سپی و بریقەدار و بە خەتێکی خۆش چاپکراوە ، بریتییە لە چوار غەزەل و ( ٣٥٥ ) چوارخشتەکی ( دوو بەیتی ) و لە ناو هەر یەکێک لەم چوار خشتەکییانەدا ، نیگارێکی زۆر جوانی روونکردنەوەیی کێشراوە ، ئەمە جگە لەوە کە پەراوێزی هەر لایەکی لە سێ لاوە بە نیگاری جوان جوانی گوڵ و لالە و وەنەوشە و مێخەک و سومبول و مۆم و پەپوولە و مانگ و ئەستێرە و تار و دەف و عود و سوراحی و دڵدار و دولبەر رازاوەتەوە و ( ١٦ ) تابلۆی رەنگینی زێدە نایابیشی تێدایە .

بەراستی گەنجینەیەکی وێژەیی ئێجگار هێژایە ، بەڵام ئەوەی سەرنجی راکێشام و دڵی گوشیم ئەوەبوو کە گوایا ئەم چوارخشتەکییانەی بابا تاهیر فارسین ، هەرچەند بڵاوکەرەوەکەشی ، لە سەرەتایەکەیدا ، دان بەوەدا دەنێ کە بە ( لەحنی لوڕی ) گوتراون ، بەڵام وا دیارە ، بە لای کابرای بڵاوکەرەوەوە ، شێوەی لوڕی ، شێوەیەکە لە شێوەکانی زمانی فارسی !! ئەمەیش هەڵەیەکی گەورەیە تەعبیر لە نەزانی یاخود لە خۆنەزانکردن دەکات ، کە سەرچاوەکەی لە شۆفینستییەوە سەرهەڵدەدات .

وەکو زانراوە ، بابا تاهیری هەمەدانی ، لە ساڵی ( ٩٣٥ )ی زاینیدا لە هەمەدان لە دایکبووە و هەر لەوێشدا لە ساڵی ( ١٠١٠ )ی زاینیدا کۆچی دوایی کردووە .

هاوچەرخی (( ئەبو عەلی سینا )) بووە و نزیکەی سەد ساڵ بەر لە (( عومەری خەیام )) رۆشنایی رۆژی بەدیکردووە (١) بە لای ئێمەوە ئەگەر بابا تاهیر لە خەیام ، بەرزتر نەبێ نزمتر نییە ، وەگ زانراوە خەیام ریشەی فەلسەفەکەی لە ئیبن سیناوە وەرگرتووە ، بەڵام بابا تاهیر ، فەلسەفەیەکی سەربەخۆی هەیە وەکو لەم گەنجینەیەدا دەبینرێ .

لە ئێراندا بەتایبەتی لە ناوچەکانی لوڕستان و هەمەداندا ، بابا تاهیر زۆر ناسراوە ، گۆڕەکەی بۆتە زیارەتگا و شوێنێکی پاک و پیرۆز ، شیعرەکانیشی وێردی زمانی گەورە و بچوکن . ئەمە بێجگە لەمە کە خۆرهەڵاتناسەکانیش ، گرنگییەکی زۆریان پێداوە و زۆری لێدواون .

چوارینەکانی بابا تاهیر ، زۆر سادە و رەوان و پرمانان ، موحسەناتی لەفزیان زۆر کەم تێدا بەکارهاتووە . بە راستی زمانی دڵ و هەستکردن و عاتیفەن ، راستەوخۆ هەر لە

دەرووی دەمەوە دەرچوون وەک مەلانی پەل و پۆ رەنگین دەنیشنە ناو هێلانەی دڵانەوە . هەر بۆیەشە کە پتر لە هەزار ساڵە گۆتراون و کەچی هەمیشە بەسەر زمانی خاسە و رەمەکی خەڵکی هەرێمەکانی لوڕستان هەمەدانەوەن .

جا زۆرم لا گران بوو کە زۆربەی خوێندەوارانی خۆشەویستی کورد زمانمان لەم خۆراکە گیانییە بێبەش بن تەنانەت لە ناسینی فەیلەسوف و رۆشنبیر و شاعیرێکی ئاوا پایەدار و دیاری هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆی کورد بێئاگانە . لەبەر ئەمانە و لەبەر ئەوەش کە بۆ هەموو کوردێک و کوردی زانێک روون بێتەوە ، دوو بەیتییەکانی ، واتا چوارینەکانی بابا تاهیر کوردین و فارسی نین ، هەرچەند بە مروری زەمان هەندێ وشە و دەربڕینیشی چەرخاونەتە سەر زمانی فارسی ئەم حەفتاوحەوت چوارینەیەم بە دەسلێدانێکی کەم خستە سەر شێوەی کرمانجی خواروو (١) ، سۆرانی . بەرادەیەک هیچ وشەیەکم لە هەندێ لەم چوارینانەدا زۆر دەسکاری نەکردووە و هەروەکو خۆیم هێشتونەتەوە . چوارینەکانی بابا تاهیر ، لەسەر یەک کێش هەڵبەستراون کە جۆرێکە لە بەحری ( هەزەج ) ، کە ئەمە تەفعیلەکانێتی :

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل

بەڵام هەموویانم لەسەر هەمان کێش وەرنەگێراون ، بەڵکو تەنیا سی و نۆ دووبەیتییەکانی پێشەوەم لەسەر هەمان کێش هێشتۆتەوە و سی و شەشی ناوەراستیشم لەسەر کێشی دە برگەیی کوردی وەرگێراوە کە فەردی مەولەوی و زۆربەی شیعری کوردی بەم کێشە هۆنراونەتەوە ، تەنیا دووانەکەی دواییم لەسەر کێشی ( متقارب ) وەرگێراوە .

خۆم تەرتیبی چوارینەکانم کردووە ، چونکە زنجیرەیەک نین ، بەڵکو هەر یەکێکیان مانایێکی سەربەخۆی هەیە و وەک هی خەیام ژمارەشیان لەسەر نییە ، هەچەند وەریشم گێراونەتەوە سەر دیالێکتی (١) کرمانجی خوارو ، بەڵام هەندێ وشەی گۆرانی و کرمانجی ژووروشی تیا بەکارهاتووە ، لە کەموکورتیش بە دوورنییە ، کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا خۆم بە بەختیار دەزانم ، ئەگەر تەقەلایەکەم تاوێک هەرچەند کەمیش بێ بکاتە سەر بوژاندنەوەی سامانی وێژەیی کوردی و گەشەپێدانی .

(١) کرمانجی خواروو ، بریتیە لە دیالێکتەکانی سۆرانی ، سلێمانی ، سنەیی موکریانی

دلزار

کۆیە : ١٩٥٧/ ١١//١٢

### لوڕی

منم ئان ئاجـرین مـرغی کـه فی الحـال
بسـوجـهم عـالەمی گـەر بەر زەنەم بال
مـصـور گـەر کـەشـد نەقـشـەم بە دیوار
بسـوجـەم عـالەم أز تأسـیـری تمثـال

### سۆرانی

منم ئەو ئاگـرین تەیرەی کـە دەرحـال
دەسـوتێنم زەمین لێکدەم پەڕ و بال
مـوسـەویر گـەر بکا نەخـشم لە دیوار
دەسوتێ خەڵک لەبەر تەئسیری تیمسال

### لوڕی

مـەگـەر شـێـر و پڵنگی ئەی دڵ ئەی دڵ
لەگـەڵ مندا لە جـەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ
ئەگـەر دەسـتم رەسـەد خـونت بریجـەم
ببـینم تا چ رەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ

### سۆرانی

مـەگـەر شـێـر و پلنگی ئەی دڵ ئەی دڵ
لەگـەڵ مندا لە جـەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ
ئەگـەر دەسـتم بگـا خـوێنت دەرێژم
ببـینم تا چ رەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ

### لوڕی

خـودایە داد أزین دل داد أزین دل
کـە یەکدەم مـو نەگـەشتەم شـاد أزین دل
چو فـەردا داد خـواهان داد خـوا هەند
بگویەم سـەد هەزاران داد ازین دل

### سۆرانی

خــــــودایە داد لـە دەس دڵ داد لـە دەس دڵ
کــەوا یەک دەم نەبووم من شــاد لە دەس دڵ
بـەیانـی داد خـــــوازان داد ئەخـــــوازن
دەبێـــــژم ســــەد هەزاران داد لە دەس دڵ

### لوڕی

بـوره ســــــووتە دڵان تـا مـــــا بـنـالـیم
زو دەســـــــتی یـاری بـی پـەروا بـنـالـیم
بشـــیم با بلبلی شـــەیدا بە گـــولشــەن
ئـەگـــــەر بـلـبل نـە نـالـە مـــا بـنـالـیم

### سۆرانی

وەرن ئـەی دڵســــــوتـاوان تـا بـنـالێـن
لــەدەس یـاری بـەبێ پـەروا بـنـالـێـن
لە بۆ لای بولبـولی شـــەیدا لە گــولشــەن
بچین بـولبـــــول نیەنـاڵێ بـا بـنـالێـن

### لوڕی

مــــوکـــــز ســـــوتە دلانم چون نـەنـالـم
مـــوکـــز بی حــــاصــــلانم چون نەنالم
نشـــســـتـــە بلبـــلان با گـــول بنالەند
مـــوکـــە دوور ئەز گـــولانم چون نەنالم ؟

### سۆرانی

لـەگـــــەڵ ســـــووتە دڵانم چۆن نـەنالـم
لـە تـەک بـی حــــاصـــــلانم چۆن نـەنالـم
ئـەنالـن بـولبـــــولانـی نـاو چـڵ و گـــــوڵ
کــــە من دوور لە گـــوڵانم چۆن نـەنالـم ؟

### لوڕی

غـەمم غـەم بی یو غـەمـخـواری دلـم غـەم
غــەمم هەم مــونس و هەم یار و هەم دەم
غــەمم نەهلە کــە مــو تەنهــا نشــینەم
مــەریزە بارک اللە مــەرحــەبا غــەم

### سۆرانی

غـەمم غـەم بێت و غـەمـخـواری دڵم غـەم
غــەمم هاو مــونس و هاوریار و هاودەم
غــەمم مــەشــرووبە تەنیــا دابنیــشم
دەمــەرژی بارک اللە مــەرحــەبا غــەم

### لوڕری

ئەلالەی کــێوهســــارانم تەئی یار
بنەفــشــەی جــو کــەنارانم تەئی یار
ئەلالەی کــێوهســاران هەفــتــەئی بی
ئومێــــدی روژ گــــارانم تەئی یار

### سۆرانی

هەلاڵەی کـــوهســــارانم ئەتۆی یار
وەنەوشــــەی جــۆیە بارانم ئەتۆی یار
هەلاڵەی کــوهســاران حــەفــتــەیەکــە
ئومــــێــــدی رۆژگــــارانم ئەتۆی یار

### لوڕی

مــوکــە ئەفــســوردە حــالم چون نەنالم
شکــســـتـــــە پەر و بالـم چون نـەنالـم
هەمــە گــوین فــلانی نالە کــەم کــون
تە ئای دەر خــــەیالـم چون نـەنالـم ؟

**سۆرانی**

کــه من پەژمــوردە حــاڵم چۆن نەناڵم
شکـســـتــــە پەڕ و باڵم چۆن نەناڵم
هەمـــوو یژن فـــلانی کـبـەم بناڵـە
ئەتۆ دێیـــتـــە خـــەیاڵم چۆن نەناڵم ؟

**لوڕی**

ئەگـەر دەسـتم رەسـەد بەر چەرخی گـەردون
ئەز ئان پورسەم کە این چون أست و ئان چون
یەکـیــرا دادەئی سـەد ناز و نیـعـمـەت
یەکـیــرا قـرصی جـو ئالودە دەر خــون !

**سۆرانی**

ئەگــەر دەســتم بگاتە چەرخی گــەردوون
دەپرسم لێی کـــەوا ئەم چونە ئەو چون
بەکێ پێت داوە سـەد جـۆر ناز و نیـعـمـەت
یەکـێکیش نانی جـۆی ئاوێتـەیی خـون !

**لوڕی**

دلی دیرم خـــریداری مـــحـــبـــەت
کـیــز ئو گـەرمـەست بازاری مـحـبـەت
لبـبــاسی بافــتـەم بەر قــامــەتی دل
زپودی مــحنەت و تاری مــحـبــەت !

**سۆرانی**

دڵێکم هەس کـــریداری مـــوحـــبــەت
لە لایا گـــەرمـــە بازاری مـــوحـــبــەت
کـــــــراســــــێکم بە بـالآیـا بڕیـوە
لە پۆیی مـــەینەت و تاری مـــوحـــبــەت !

**لوڕی**

ز دەستی دەیدە و دل هەرد و فریاد
هر ئان چە دیدە بینە دل کونەد یاد
بسازەم خەنجەری نیشەش ز پولاد
زەنەم بەر دیدە تا دل گەردەد ئازاد

**سۆرانی**

لە دەس چاو و لە دەس دڵ هەردوو فەریاد
کە چاو هەرچی ببینێ دڵ دەکا یاد
دەکەم من خەنجەرێ نووکی لە پۆڵاد
ئیتر دەیدەم لە چاو تا دڵ بێ ئازاد

**لوڕی**

إلاهی گەردەنی گەردون شەوەد خورد
کە فرزەندی جیهانرا جوملەگی بورد
یەکی نایە فلانی زیندە وا بی
هەمی گویەند فلان ابنی فلان مرد !

**سۆرانی**

خودایە گەردەنی گەردوون ببێ ورد
کە رۆڵانی جیهانی سەر لەبەر برد
یەکێ نەی گووت : فلان وا زیندوو بۆوە
دەڵێن گشتیان فلانی کوڕ فلان مرد !

**لوڕی**

تەنی محنەت کەشی دیرم خودایا
دلی حسرەت کەشی دیرم خودایا
ز شەوقی مەسکەن و دادی غەریبی
بە سینە ئاتەشی دیرەم خودایا

**سۆرانی**

لەشێ مـەینەت کـەشم هەس ئەی خـودایە
دڵێ حـەسـرەت کـەشم هەس ئەی خـودایە
لە تاوی مـەفـتـەن و دادی غـەریبی
لە سـینە ئاتەشم هەس ئەی خـودایە

**لوڕی**

ز بویی زولفی تو مـەفـتـونم ئەی گـول
زرەنگی روویی تو دلخـونم ئەی گـول
منی عـاشق ز عـشـقت بی قـەرارم
تو چون لەیلا و من مـەجنونم ئەی گـول !

**سۆرانی**

لە بویی زوڵفی تۆ مـەفـتـونم ئەی گـوڵ
لە رەنگی رووی تۆ دڵخـونم ئەی گـوڵ
منی عـاشق لە عـشـقت بێ قـەرارم
ئەتۆ وەک لەیل و من مەجنوونم ئەی گوڵ !

**لوڕی**

وەگـەر شـەو شـود کـە مـو جـونم بسـوزەد
گـریبـان تا بە دامـونم بسـوزەد
بەرایی خـاتری یەک سـەبزە رەنگی
هەمی ترسـەم کـە ایمونم بسـوزەد !

**سۆرانی**

کـەشـەو داهات ئەمن گـیـانم دەسـوتێ
لە یاخـە تا بەدامـانم دەسـوتێ
لەبەر خـاتر نیگارێ سـەوزە رەنگێ
دەترسم من کـە ئیـمـانم بسـوتێ !

**لوڕی**

تە کــە ناخــوندەیی علمی ســمــاوات
تە کــــە نابردەیی رە دەر خـــــەرابات
تە کــــە ســـود و زیانی خـــود نەزانی
بە یارون کـەی رەسی هیـهـات هیـهـات !

**سۆرانی**

کـە تۆ نەتخـوێندووە عـیلمی سـەمـاوات
کــەتۆ نابەیتــە دەر رێ لە خـــەرابات
کــە تۆ ســوود و زیانی خـــۆت نەزانی
بە یاران کـەی دەگـەی هەیهـاتە هەیهـات !

**لوڕی**

هەلالەی کــوهســـاران هەفـــتـــەیی بی
بنەفـشـەی جـۆ کـەناران هەفـتـەی بی
منادی مـــیکـەر و شـــەهروبە شـــەهرو
وەفـــایی گـــولعـــوزاران هەفـــتـــەی بی

**سۆرانی**

هەڵاڵەی کــۆهســـاران حـــەفـــتـــەیەکـــە
وەنەشـەی جـۆ کـەناران حـەفـتـەیەکـە
کـە جـارچی شـار بە شـار بانگ رادەهێـڵێ
وەفـــایی گـــوڵعـــوزاران حـــەفـــتـــەیەکـــە

**لوڕی**

بـورە روزی کـــــــــە دیـداری تـە ویـنـم
گـــول و ســـمـــبـــول بە دیداری تە چینم
بورە بنشین بـەرەم ســـــالان و مـــــاهـان
کــــە تاســــیـــــرت بوینم نازەنبنم !

**سۆرانی**

وەرە ڕۆژێـک کـــە دیدارت ببـــینم
بە دیدارت خـــەریکی گـــوڵ چنینم
لەلام بێ : دابنیـشـــە مـــانگ و ســـاڵان
هـەتـا تێـــرت ببـــینم نازەنینم !

**لوڕی**

دلـم زار و حـــــەزینـە چـون نـەنـالـم
وجـــــودم ئـاتـەشـــــینـە چـون نـەنـالـم
بە مـــــو واچەن کـــە چون و چەند نـالی
چو مـــەرگم دەر کـــەمـــینە چون نەنالم ؟

**سۆرانی**

دڵـم زار و حـــــەزینـە چـون نـەنـاڵـم
وجـــــودم ئـاگـــــرینـە چـون نـەنـاڵـم
دەبێـــژن پێـم کـــە چۆن و چەند دەناڵی
کـە مـــەرگم لە کـــەمـــینە چون نەناڵم ؟

**لوڕی**

خـوش ئان سـاعـەت کـە دیداری تو وینم
کـــەمـــەندی عـــەنبـــەرین تاری تو وینم
نەوینە خـــورەمی هەرگـــیـــز دلی مـــو
مـەگـەر ئان دەم کـە روخـســاری تو وینم !

**سۆرانی**

خـــۆشـــە ئەو ســـاتە دیدارت ببـــینم
کـــەمـــەندی عـــەنبـــەرین تارت ببـــینم
گـــوشـــادی نابینی هەرگـــیـــز دڵی من
مـەگـەر ئەو ســاتە روخـســـارت ببـینم !

### لوڕی

درەختی غەم بەجانم کەردە ریشە
بەدەرگاهی خودا نالەم هەمیشە
عەزیزون قەدری یەک دیگەر بزونید
ئەجەل سنگ ئەست و ئادەم مثلی شیشە!

### سۆرانی

درەختی غەم لەگیان کردوویە ریشە
لەدەرگەی خوا دەناڵێنم هەمیشە
عەزیزان بابزانین قەدری یەکتر
ئەجەل وەک بەردە ئینسان چەشنی شیشە

### لوڕی

عاشق ئون بی کەدایم دەر بەلا بی
ئەیوب ئاسا بەکرمون موتبەلا بی
حەسەن ئاسا بنوشە کاسەیی زەهر
حسین ئاسا شەهیدی کەربەلا بی!

### سۆرانی

ئەوەی دڵدارە، گیرۆدەی بەڵایە
ئەیوب ئاسا بەکرمان موبتەلایە
حەسەن ئاسا بنۆشێ کاسەیی ژار
حوسین ئاسا شەهیدی کەربەلایە!

### لوڕی

بواجی کەچرا تە بی قەراری
مەگەر پەروەردەیی بادی بەهاری
چرا گەردی بەکوهو دەشت و سەحرا
بە جانی تە نەدارەم ئیختیاری

**سۆرانی**

دەبێـــژن پێم کـــە بۆچی بێ قـــەراری
مـــــەگـــــەر پەرڕردەیی بایی بەهاری
لەبۆچی وێڵی کـێـو و دەشت و سـەحـرای
بەگـیـانت نیـمـە تاوی ئیـخـتـیـاری

**لوڕی**

مـــو ئان ئەسـپـــیـــدە بازم همـــدانی
لانە دەر کـــوە دارم دەر نیــــهــــانی
بە بالی خـــود پەرەم کـــوهان بەکـــوهان
بەچنگی خـود کـەرەم نەخـچـیـرە بانی

**سۆرانی**

ئەمـن ئەو ســـپی یە بازەم هەمـــەدانی
کـــەهێـــلانەم لەکـــێـــوە لەنیـــهـــانی
بەباڵی خـــۆم ئیـــدی دەفـــڕم کـــەژاو کـــەژ
بەچنگی خـــۆم دەکـــەم نێـــچـــیـــرەوانی

**لوڕی**

ئیـــلاهی ئەی فـــەلەک چون من زەبون شی
دلت هەم چون دلی مـــو غـــەرقی خـون شی
ئەگـــەر یەک لەحـــزە ئەم بێ غـــەم ببـــینی
یەقین زو نەم کـزین غـــەم سـەرنگون شی

**سۆرانی**

خـــودایە ئەی فـــەلەک وەک من زەبوون بی
دڵت هەروەک دڵی من غـــەرقی خـــوون بی
ئەگـــەر ســـاتێ ببـــینی من بە بێ غـــەم
یەقین مـــە ســا لەداخـــا ســـەرنخـــوون بی

**لوڕی**

زەمـــانی لالەزاران هەفـــتـــەئی بی
کـــە فـــەصلی نەوبەهاران هەفـــتـــەئی بی
غـــەنیـــمـــەت دون وصـــالی یاری جـــانی
کـــەوەصلی ڕوویی یارون هەفـــتـــەئی بی

**سۆرانی**

زەمـــانی لالەزاران حـــەفـــتـــەیەکـــە
کـــەفـــەسلی نەوبەهاران حـــەفـــتـــەیەکـــە
هەلێکە یاری گـــیـــانیت دەسکەوێ تۆ
کـــەوەســـڵی ڕووی یاران حـــەفـــتـــەیەکـــە

**لوڕی**

بەخـــەنجـــەر گـــەر دەراوەند دیدەگـــونم
بەئاتەش گـــەر بســـۆزەن ئـــستـــو خـــونم
ئەگـــــەر بەر ناخنونم نەی بکو بەن
نەگـــیـــرەم دل ز یاری مـــهـــرەبونم

**سۆرانی**

بەخـــەنجـــەر گـــەر دەرێنن دیدەکـــانم
بەئاگـــرو بســـووتێنن ســـوقـــانم
ئەگـــەر نەی ئاژنیش کـــەن ناخـــو نانم
نکۆڵ ناکـــەم لەیاری مـــهـــرەبانم

**لوڕی**

مـــو کـــە چون ئوشـــتـــرم قـــانع بەخـــارم
خـــوراکم خـــارو خـــەرواری بە بارم
ئەز ئین خـــەرجی قلیل و باری ســـەنگین
هنوز ئەز ڕوویی مـــالک شـــرمـــە ســـارم!

**سۆرانی**

کـــه مـن وەک حـــوشـــتـــرم قـــانـع بەخـــارم
خـــــــۆراکـم درِک و خـــــــەروارێـکە بـارم
لەسـەر ئەم خـەرجـە سـووکـەو بارە قـورسـەش
لەرووی خـــاوەن هەمـــیـــســـان شـــەرمـــەزارم!

**لوڕی**

ئەگـــــەر جـــــایەت بە چەرخی چارەمین بی
مـەدومـەت گـورگی مـەرگ ئەندەر کـەمین بی
وەگـــــەر ســــــەدســـــاڵ در ئین دنیـــا بمـوئی
در ئـاخـــــــــــر مـنـزلـت زیـری زەمـین بـی

**سۆرانی**

ئەگـــەر جـــێـگەت لەچەرخی چوارەمـــینە
کـــە مـــادام گـــورگی مـــەرگت لەکـــەمـــینە
ئەگــــــەر ســــــەد ســـــاڵ لەدنیــــادا بمینی
لەئاخــــیـــــر مـــــەنزلت ژێری زەمــــــینە

**لوڕی**

مــــــســلـســل زولف بـەر رو ریتــــــەدیـری
گـــول و ســـومـــبـل بەهەم ئامـێـتـــە دیری
پەریشـــــان چون کـــەری ئان تاری زولفـــان
بـەهـەر تـاری دلـی ئـاویـتـــــــــــە دیـری

**سۆرانی**

بەســـــەر رووتا زولف قـــەف قـــەف رژاوە
کـــەوا ســـومـــبـــول بەگـــوڵ تێکەڵ کـــراوە
پەرێشــــان چۆن ئەکـــەی تۆ تاری زوڵفـــان
بـەهـەر تـارێ دڵـێ هـەڵـواســــــــــــراوە.!

### لوڕی

شەوی تار ئەست و گورگان میزە نەن میش
دو زلفونت حمـــایل کن بورە پیش
ئەز نان گـــەنجی لەبت بوسی بە مـــو دە
بگو راهی خـــودا دادەم بە درویش!

### سۆرانی

شەوی تاریکە گورگان مەڕ دەکەن کێش
دوو زوڵفانت حەمایل کەو وەرە پێش
لەئەم گـــەنجی دەمت مـــاچێ بە من دە
بڵێ: گیانە، لەرێی خوا دام بە دەروێش!

### لوڕی

نیگارینا دل و جـــانم تە داری
هەمـــە پەیدا و پەنهـــانم تە داری
نە میزو نەم کە ئین دەرد ئەز کە دارم
هەمین زونەم کە دەرمـــانم تە داری

### سۆرانی

نیگاری دڵ، دڵ و گـــیـــانم لە لاتە
هەمـــوو پەیداو پەنهـــانم لە لاتە
ئیتـــر نازانم ئەم دەردەم لەکێ گـــرت
دەزانم بەس کـــە دەرمـــان لە لاتە

### لوڕی

بورە بورە کـــە جـــانانم توئی تو
بورە بورە کـــە سلطانم توئی تو
تە خـــود زونی کەغـــەیر ئەز تو نەزونم
بورە بورە کـــە ئیـــمـــانم توئی تو

### سۆرانی

ده بێــره بێــره خــۆ گــیــانم ئەتۆی تۆ
ده بێـــره بێــره ســولّتـــانم ئەتۆی تۆ
تــەزانــی ئــەز بــەغــــــەیــرەز تــه نـزانم
ده بێـــره بێـــره ئیــمــــانم ئەتۆی تۆ

### لوڕی

غــەمی دەردی دلی مــو بی حــیـــسـابه
خـــودا زونه کـــه مـــرغی دل کـــەبابه
بـنـــازم دەسـت و بــازوویـــی تــه جـلــلاد
ئەگـــەر قـــەتلم کـــەری واللە ثوابه

### سۆرانی

غــەمی دەردی دڵی من بێ حــیـســابه
خـــــودا دەیزانـی تەیری دڵ کــــەبابه
بـەقــــەتلّی دەست و بـازووی تۆ دەنـازم
ئەگـــەر بێ بمکوژی به خـــوا ســـەوابه

### لوڕی

فلـک کـــەی بشنەوەد ئاهو فـــغـــانم
بەهەر گــــەردوش زەنەد ئـاتش بجـــانم
یەک عـــمـــری بگوزەرانم باغــەم و دەرد
بەکــامی دل نه گـــەر دەد ئاســمـــانم

### سۆرانی

فــەلەک کــەی ئەشنەوێ ئاهو فــیــغــانم
بەهەر ســـوڕێ ئەدا ئاگــر لەگــیـــانم
بەمــەینەت کـێــشی عــومــرێکم بەســەربرد
به کـــامی دڵ نەســـووڕا ئاســـمــانم

### لوڕی

من ئان ڕەندەم کـــە نامم بی قـــەلەندەر
نە خـــان دیرەم نە مـــا دیرەم نـە لەنگەر
چو روز ئایە بگەردەم گـــەردی گـــیـــتی
چو شـەو ئایە بەخـشـتی وا نە هەم سـەر!

### سۆرانی

من ئەو ڕەندەم کـــەوا ناومـــە قـــەلەندەر
نەخـــانم هەس نەمـــانم هەس، نە لەنگەر
کـــە ڕۆژ داهات لەدنیـــادا دەخـــۆم خـــول
کە شەو داهات بەسەر خشتێ دەکەم سـەر!

### لوڕی

عـــەزیزون مـــوســـمی جـــۆشی بەهارە
چەمـــەن پر ســـەبزە ســـەحـــرا لالەزارە
دەر ئین مـوسم دەمێ فـرسـەت غـەنیـمـەت
کـــەدنیـــایی دەنی بی ئیـــعـــتـــبـــارە

### سۆرانی

عـــەزیزان مـــەوســـمی جـــۆشی بەهارە
چەمـــەن پڕ ســـەوزە، ســـەحـــرا لالەزارە
دەمێ لەم وەرزە دا دەرفـــەت بە دەســـخـــە
کـــەوا دنیـــای دەنی بێ ئیـــعـــتـــیـــبـــارە

### لوڕی

بە دامـی دلبـــەری دل مـــــوبتـــەلابی
کـــە هجـــرانەش بەلا وەصلەش بەلا بی
در ئین ویرانە جـــز دلخـــون نەدیدەم
نە دل گـــوئی کـــە دەشـــتی کـــەربەلا بی!

### سۆرانی

بەداوی دڵبەرێ دڵ موبتەلایە
کە هیجرانی بەڵا وەسڵی بەڵایە
بە غەیرە ز خوێنی دڵ نەمدی لە ناویا
دەڵێی- وێرانبێ- دەشتی کەربەلایە!

### لوڕی

بەلا بی دل خودایە دل بە لابی
گوناه چەشمان کەرو دل موبتەلابی
ئەگەر چەشمان نەکەردی دیدە بانی
چ دانستی دلم خوبان کوجا بی!

### سۆرانی

بەڵایە دڵ خودایە دڵ بەڵایە
کە چاو تاوان ئەکا دڵ موبتەلایە
ئەگەر چاوان، نەکەن چاوبازی ئاخر
دڵم چوزانی جوان ها لە چ لایە!

### لوڕی

عەزیزان مەردی ئەز نامەرد نائی
فغان و نالە ئەز بی دەرد نائی
حقیقەت بشنەو ئەز پوری فەرەیدون
کە شعلە ئەز تەنوری سەرد نائی

### سۆرانی

ئازیز قەت مەردی، لەنامەرد نایە
فیغان و نالە لەبێ دەرد نایە
راستی لەرۆڵەی فەرەیدون ببیە
گڕ لەتەنووری سڕ و سەرد نایە

**لوڕی**

دلی شـــاد ئەز دلی زارەش خـــەبەر نی
ســەلامەت روو ز بیـــمـــارەش خــەبەر نی
نە تقــصـــیـــری تە ئین رەســمی قــەدیە
کــە ئازاد ئەز گــرفــتــارەش خــەبەر نی!

**سۆرانی**

دڵی شـــاد ئاگـــای لەدڵزار نیـــیـــە
سپ و ســاغ ئاگــای لەبیـــمـــار نیـــیـــە
ســووچی تۆ نیـــیـــە رەســمـــێکی کــۆنە
ئازاد لەئەســـیـــر ئاگـــادار نیـــیـــە!

**لوڕی**

دنیـــا خـــوان بی و مـــردم مـــیـــهـــان بی
ئیـــمـــروز لالە بی و فـــەردا خـــەزان بی
ســیــا چال کــونەن نامــەش نە هەن گــور
بەمــو واچەن کــە ئینەت خـــان و مـــان بی

**سۆرانی**

دنیـــا ســفــرەیە و مـــەردوم مـــیـــوانە
ئەمـــڕۆ بەهارە و ســـبـــەی خـــەزانە
چاڵی رەش دەکـــەن ناوی دەنێن گـــۆڕ
پێم دەڵێن ئەمـــەت جێ و خـــان و مـــانە

**لوڕی**

دلی مـــو غـــەیری تە دلبـــەر نەگـــیـــرە
بەجـــایی جـــەوهەری جـــەوهەر نەگـــیـــرە
دلی مـــو ســـووتەو مـــیـــهـــری تە ئازەر
بی ناســـــووتە ئازەر دەر نەگـــیـــــرە

**سۆرانی**

دڵ بەغـــەیری تۆ، دڵبـــەر ناگـــرێ
لەجـێی گـــەوهەرێ، گـــەوهەر ناگـرێ
دڵ ســووتەمـــەنی و عـیـشـقی تۆ ئاگـر
بێ ســـووتەمـــەنی ئاگـــر ناگـــرێ

**لوڕی**

ســەرم ســەودایی گـیـســـویی تە دارە
دلم مـــهـــری مـــەهی روویی تە دارە
ئەگـەر چەشـمـەم بەمـاهی نەو کـەرە مـەیل
نـەزەر بـەر تـاقـی ئـەبـروویـی تـەدارە

**سۆرانی**

ســەرم ســەودایی گـێـســوی تۆی هەیە
دڵ عـیـشـقی مـانگی روویی تۆی هەیە
گـــەر چاوم مـــەیلی مـــانگی نەو بکا
بـیـنـیـنـی تـاقـی ئـەبـرۆی تـۆی هـەیـە

**لوڕی**

بی تە گـولشـەن چو زیندانە بەچەشـمـەم
گـولســتـان ئازەرسـتـانە بەچەشـمـەم
بی تە ئارام و عـــومـــرو زیندەگـانی
هەمـو خـوابی پەریشـانە بە چەشـمـەم

**سۆرانی**

گـــوڵشـــەن بە بێ تۆ وەک زیندانە لام
گـوڵسـتـان وەکـو ئاگـرسـانە لام
بـێ تـۆ ئـارام و عـــومـــرو ژیـانم
هەمـــووی وەک خـــەوی پەرێشـانە لام

**لوڕی**

بی تە بالین سـیـە مـارە بە چەشـمـەم
بێ تە روزان شـەوی تارە بەچەشـمـەم
بیـتـە هەر گـاە شـەوەم سـەیری گلسـتـان
گـولسـتـان سـەر بەسـەر خـارە بەچەشـمـەم

**سۆرانی**

سـەرین بە بێ تۆ وەک ڕەشـمـارە لام
ڕوژی ڕوون بـێ تـۆ شـەوی تـارە لام
بێ تۆ هەر کـاتێ سـەیری گـوڵشـەن کـەم
گـوڵشـەن سـەراسـەر چقڵ و خـارە لام

**لوڕی**

بەشـەو مـەحـوی روخی مـە پارە هەسـتـەم
بەروز ئەز دەرد و غـەم بی چارە هەسـتـم
توداری دەر مـەکـانی خـود قـەراری
مـویەم کـە دەر جـیـهـان ئاوارە هەسـتـەم

**سۆرانی**

بەشـەو فـەوتاوی ڕووی مـەه پارەمـە
بەڕۆژ لـەدەردو غـەم بێ چارەمـە
تۆ لەشـوێنی خـۆت سـرەوتت هەیە
منم لـەدنـیـا کـە ئاوارەمـە

**لوڕی**

گـولسـتـان جـایی تو ئەی نازەنینم
مـو دەر کـولخـەن بەخـاکـسـتـر نشـینم
چ دەر گـولشـەن چ دەر کـولخـەن چ سـەحـرا
چو دیدە وا کـەرەم جـز تە نەوینم

### سۆرانی

گـــوڵشـــەن جـــێی تۆیە ئەی نازەنینم
منیش لەکـوڵخـەن مـشکی(١) نشـینم
چ لەگـوڵشـەن و کـوڵخـەن و سـەحـرا
کـــــە چاو هەڵێنم هەر تۆ دەبینم

### لوڕی

نزونەم مـو کـە سـەرگـەردان چرا یەم
گـەهی گـریان گـەهی نالان چرا یەم
هەمـــە دەرمـــانشـــان بی دەردەداران
نزونەم مـو کـە بی دەرمـان چرا یەم؟

### سۆرانی

ئەمن نازانم بۆ ســـەرگـــەردانم
گـــەهی لەگـــریان گـــەهـ لەنالانم
هەمـوو نەخـۆشـێک، دەرمـانی هەیە
نازانم کـــە من بۆ بێ دەرمـــانم؟

### لوڕی

هەر ئان کەس عاشق ئەست ئەز جان نەترسد
عـــاشق ئەز کندەو زیندون نەترســـد
دلی عـــاشق بود گـــورگی گـــرسنە
کـە گـورگ ئەز هی هی چوپان نەترسـد

---

(١) مشکی: خۆڵەمێش.

**سۆرانی**

هەر کـەس عـاشق بی لەگـیـان ناترسێ
عـــاشق لەکـــۆت و زینـدان ناترسێ
دڵ عــاشق بۆتە گـــورگـــێکی برسی
کـــە گـــورگ لەهێ هێی شـــوان ناترسێ

**لوڕی**

ســەری دارەم کــە ســامــانەش نەمی بو
غـــەمی دارەم کـــە پایانەش نەمی بو
اگـــــر باوەر نەداری ســـویی من ئای
بوین دەردی کـــە دەرمـــانەش نەمی بو

**سۆرانی**

ســەرێکم هەیەو ســامــانی نیـــیـــە
غـــەمـــێکم هەیەو پایانی نیـــیـــە
گـــەر بڕوا ناکـــەی وەرە ببـــیـــنە
ئەو دەردەی کـــەوا دەرمـــانی نیـــیـــە

**لوڕی**

دلم مـــەیلی گـــولی باغی تە دیرد
ســـەراســـەر ســـینە آم داغی تە دیرە
بشم ئا لالەزاران دل کـــەرەم شـــاد
دیـــەم ئـــا لالـــە هـــەم داغـــی تـــە دیـــرە

**سۆرانی**

دڵ مـــەیلی گـــوڵی باغی تۆی هەیە
ســـەراســـەر ســـینەم داغی تۆی هەیە
چومـــە لالەزار دڵ بکەم گـــوشـــاد
دیم کـــــەوا لالەش داغی تۆی هەیە

لوڕی

هەرئان دولبەر کە چەشمی مەستی دارە
هەزاران چون منی پابەست دارە
میانی عاشقان ئان ماهی سیما
چوشیعری من بلند و پەستی دارە

سۆرانی

هەر ئەودولبەرەی چاوی مەستی هەس
هەزارانی وەک ، من پابەست هەس
لە ناو عاشقانا ئەو مانگ روخسارە .
وەکو شعری من بەرز و پەستی هەس

لۆڕی

دەمی بورە بوین حالم تە دولبەر
دلم تەنگە شەوی با مو بەسەر بەر
تە گول بەر سەرزەنی ئەی نەو گولی مو
بەجایی گول زەنەم مو دەست بەرسەر!

سۆرانی

دەمی بی : حالم ببینە دولبەر
پەستم شەو یکم لە گەڵ بەرە سەر
گوڵ لەسەر دەدەی ئەی نەو گوڵی من
من لە باتی گوڵ دەست دەددم لەسەر !

لوڕی

جورە بازی بودم رەفتەم بە نەخچیر
سیاه دەستی زەدە بەربالی موتیر
بورە غافل مەچەر ددر چەشمە ساران
هەر ئان غافل چەرە غافل خورە تیر

### سۆرانی

جــورە بازی بووم چووم لە بۆ نێــچــیــر
دەســتــێکی رەش دای لە باڵی من تیــر
غــافل تۆ مــەخــۆ لە چەشــمــە ســاران
غــافڵ تۆ بخــۆی غــافڵ دە خــۆی تیــر

### لوڕی

خــــــوداوەندا بە فــــــریادی دلم رەس
کــەسی بی کــەس تونی مــومــاندە بی کــەس
هەمــــە گــــویەند تاهیــــر کـــەس نەدارە
خــودا یاری مــەنە چ حــاجــەتی کــەس

### سۆرانی

خــــوایە بۆ دڵم ببـــە فـــــریادرەس
کـــەسی بێکەس تۆی من مـــاوم بێکەس
هەمــــوو هەردەڵێن تاهیـــر بێکەســـە
خـــوا یاری منە چ پێـــویست بە کـــەس

### لوڕی

جـــیــهـــانی بی وەفـــا زیندانی مـــابی
خــاری غــەم قــســمــەتی دامــانی مــابی
صــبــری ئەیوب و مــحنەتهــای یعــقــوب
هەمــە گــوئی نصــیــبی جــانی مــابی

### سۆرانی

دنیـــــای بی وەفــــا زیندانی مــــەیە
دڕکی غــــەم بەشی دامــــانی مــــەیە
ســـەبری ئەیوب و مــــەینەتی یاقــــووب
هەمــــووی نســـیـــبی گــیــانی مــەیە

### لوڕی

دل ئەز دەستی غەمت زیر و زەبەر بی
دوچەشمانم پڕ ئەز خونی جگەر بی
هەر ئان یاری عزیزەش نازوەربی
دلەش پر غصە جانەش پڕ شەرەر بی

### سۆرانی

دڵ لە دەس غەمت ژێر و ژەبەرە
چاوانم پڕیان خوێنی جگەرە
ئەوەی دولبەری جوان و نازدارە
دڵ پڕ لە داخ و گیان پڕشەرەرە

### لوڕی

قەدەم دایم زباری غصە خەم بی
چومو محنەت کەشی دەر دەهر کەم بی
مو هەرگیز ئەز غەم ئازادی نەدیدەم
دلی بی طالعی مو کوه غەم بی

### سۆرانی

قەدم لە ژێری باری غەم خەمە (١)
وەک من مەینەت کێش لە دنیا کەمە
لە دەس غەم هەرگیز ئازادیم نەدی
دڵەی بەدبەختم کۆساری غەمە

---

(١) خەم: چەماو

**لوڕی**

کەسی کەرا ، بەبی دادم برە نی
خەبەر بەر سەروی ئازادم برە نی
تەمامی خوب رویان جمع کەردەند
کەسی کەیادت ئەز یادم برە نی !

**سۆرانی**

کەس نییە ڕێم بۆ بی دادم ببا
خەبەر بۆ سەروی ئازادم ببا
سەرپاکی جوانان گەر کۆبینەوە
کەس نییە یادت لە یادم ببا !

**لوڕی**

غەریبی سەخت ، مرا دلگیر دارە
فەلەک بەر گەردەنم زنجیر دارە
فەلک ئەز گەردەنم زنجیر بەردار
کە غور بەت خاکی دامەن گیر دارە

**سۆرانی**

غەریبی ناخۆش کەدڵگیرمە
فەلەک هۆی ملی بە زنجیرمە
فەلەک لە ملما زنجیر دەرێنە
کە خاکی غوربەت دامەن گیرمە

**لوڕی**

بەدونیا مو نەوینم کام بی تە
بەدەست هەرگیز نەگیردم جام بی تە
بلەرزم رۆژ و شەو چون بیدی مەجنون
نەدارەم یەک نەفەس ئارام بی تە

**سۆرانی**

بی تۆ نابینم لە دنیادا کام
من بە دەستەوە هەرگیز ناگرم جام
دەلەرزم رۆژ و شەو وەک شۆرەبی
بەبی تۆ نیمە یەک نەفەس ئارام

**لوڕی**

یەکی برزیکەری ئالون دەرئین دەشت
بەچەشمی خون فشان ئالالە میکە شت
هەمی کشت و هەمی گفت ئەی دریغا
کەباید کیشتن و هیشتن دەر ئین دەشت

**سۆرانی**

وەرزێرێ لە ئەم دەشتە دەینالاًن
بە چاوی خونبار هەلاًلەی دەچان
هەردەی وەشاند و دەیگوت دریغا
دەبی لەم دەشتە چاندن و جێمان

**لوڕی**

دلّم تەنگی نەدانەم صبر کەردن
زودلتەنگی بوەم رازی بە مردن
زوشەرمی رووی تە مو دەر حجابم
نەدانەم عرض حالم واتە کردن

**سۆرانی**

دلتەنگم نیمە هیچ ئۆقرە گرتن
لەبەر دلتەنگی رازیم بە مردن
لە شەرمی رووی تۆ لە ژێر پەچەدام
نازانم عەرزی حالّ بەیان کردن

**لوڕی**

کــوجــا بی جــای ته ئەی یاری دلخـــواه
کــه تا مــو بســپـــەرەم ئان جــایەگــەراه
هەمـــەجــا جـــایی تەمـــو کـــور باطن
غلط واتەم غـلط اســـتـــغـــفـــرالله

**سۆرانی**

کــویّ یه جــێگای تۆئەی یاری دڵخـــوا
هــەتــا ئــەو جی یــه بــکــەم بــه ڕێــگــا
هەمـــووجی جــێــتــه کـــوێری باطنم
خــەتام گــوت خـــەتا اســتــغـــفـــرالله

**لوڕی**

نەســیــمی گــیــز بنی ئان کــاکـــول ئایو
مـــرا خـــوشـــتـــر زبویی ســومـــبـــول ئایو
چوشـــەو گــیــرەم خــەیالتــرا دەر ئاغــوش
ســـحـــر ئەز بســـتـــرەم بوی گـــول ئایو

**سۆرانی**

نەســـیـــمێ کـــەوا له بن کـــاکـــۆڵ دی
لەلای من خــۆشــتــر له بۆی ســومــبــول دی
بـەشـــــەو خـــــەیالت بـگـرم له بـاوەش
لەســەر ســەرینمــا ســەحــەر بۆی گــوڵ دێ

**لوڕی**

دلم ئەز عـــشـــقی خـــوبان گـــیـــجـــو ویجــه
مـــــژه بەرهەم زەنەم خـــــوناوه ریجـــــه
دلی عـــــاشق مـــــشــــالی چوپی تەڕبی
ســەری ســـوجــه ســەری خـــوناوه ریجــه !

**سۆرانی**

لەعــیــشــقی جــوانان دڵ گــێــژ و وێژە
برژانــگ کـــە لێک دەم خـــوناوە رێژە
دڵـــی دڵـــداران وەک داری تـــەرە
ســـەرێ گـــڕ ســـەرێ خـــوناوە رێژە !

**لوڕی**

دلت ئەی ســـەنگ دل بەرمـــا نەســـوجی
عـەجـەب نەبوەد ئەگـەر خـارا نەسـوجی
بســـوجــەم تا بســـوجـــانەم دلتـــرا
دەر ئازەر چوپ تر تەنـهـــا نەســـوجی

**سۆرانی**

دڵت ئەی دڵ بەرد ، بە مـن ناســـووتێ
هیچ ســەیر نیــیــە خـارا(١) ناســووتێ
بســـــووتێم، دڵت تابســـــووتێنم
چونکە داری تەڕ تەنیـــا ناســـووتێ

**لوڕی**

مـــادامـــەم دل پر ئەز خـــونی جگەر بی
مـــادامـــەم جـــان حـــەزین و دیدە تەربی
نشـــینم بەر ســـەری راهت شـــەو ورۆژ
بوەد روزی تـورا بـەرمـــو گـــوزەربی

---

(١) خارا: بەرد

### سۆرانی

مـــادامـــەم دڵ پڕبێ لە خـــوێنی جگەر
مـــادام گـــیـــان زار بێ و دیدەکـــانم تەڕ
شـــەو و ڕۆژ لەســـەر ڕێت دادەنیـــشم
ڕۆژێ دی بـکـەی بەلامـــــاگـــــوزەر

### لوڕی

بـوەد دەردم و دەر مـــــــونم ئـەز دوسـت
بـوەد وەصـلـم و هـجـــــرونم ئـەز دوسـت
ئەگـر قـصـــابەم ئەز تەن وا کـــەره پوست
جـودا هەرگـیـز نەکـرده جـونم ئەز دوست

### سۆرانی

لــە یـارەوەیــە دەرد و دەرمـــــــــــانم
لە یارەوەیە وەصـل و هـیـــــجـــــرانم
قـەسـاب گـەر پێـســتم لە لەش دامـاڵێ
جـــیـــا نـاکـــاتـەوە لە یارگـــیـــانم

### لوری

ســـەری کـــوهی بلند چە ندان نشـــینم
کـــەلالە ســـەر دەراره مـــو بچـــینم
چولالـە بێ وەفـــا بوێ وەفــــا بـو
نیـکاری بی ودفـــا مـــو چون کـــوزینم؟

### سۆرانی

چەندە دا نیـشـــتووم لەســەرکـێـوی بەرز
کـــەلالە بچنم ســــەر دەرکــا لـە ئەرز
وەک لالـە وا یـە بـە بێ وەفـــــایـە
چۆن بموێ یاری بە بێ وەفــــا تـە رز ؟

**لوڕی**

زمـــشـک چین ســیــه هتــر ســونبلت بی
هەزاران دل بە قـــەیدی کـــاکـــولت بی
نە بـاشـــــــەد نـا لـە ئـەم رادەر دلت راه
زخـــــارا ســــەخت تر گـــوَیا دلت بی

**سۆرانی**

لە مــیــسکی چینی رەشــتــر ســومــبـولّـتـە
بەهـەزاران دڵ بەنـدی کـــاکـــۆلّـتـــــە
ڕێـــگـــا بـــە دڵـــت نـابـــا نـــالّـــەی مـــن
لە بەردان ڕەقـــتـــر ســەخـــتـــتـــر دڵتـــە

**لوڕی**

نەمـــیـــزونەم دلم دیو نەیی کـــیـــست ؟
کـوجـا مـیگەردەد و دەرخـونەیی کـیـست ؟
نەمـــیـــزونەم دلی ســـەر گـــەشـــتـــەیی مـــو
ئەسـیـری نرگـسی مـەسـتـونەیی کـیـست؟

**سۆرانی**

نـازانم دڵـم دێوانـەی کـــــیـــــــیـــــــە ؟
لە کــوێ دەگـــەڕێ و لە خــانەی کــێــیــە ؟
نـــــازانم دڵـــــەی ئـــــاوارەیــــی مــــــن ،
دیلی نێــرگــزی مــەســتــانەی کــێــیــە ؟

**لوڕی**

مــوئـان رەندم کــە عــصــیـــان پیــشـــە دیرم
بە دەســـتی جـام و دەســتی شــیـشــە دیرم
ئەگـــــەر توبی گناهی رو مـــــەلەک شـــو
مـــــو ئاز حـــــوا و ئادەم ریشـــــە دیرم

### سۆرانی

مـن ئەورەندەمـە ، عـوسـیـانە پـیـشـەم
بە دەسـتێ جـام و بەدەسـتێ شـیـشـەم
گـەرتۆ بێ خـەتای ببـە فـریشـتـە
مـن لە حـەوا و ئادەمـە ریشـەم

### لوڕی

گـولی کـە خـوم بدا دەم پیچ و تابەش
بەئـابـی دیـدەگـانم دادەم ئـابـەش
بە دەرگـا هـی ئالاهـی کـەی رەوا بو
گـول ئەز مـو دیگەری گـیـرە گـولابەش ؟

### سۆرانی

گـولێ خـۆم بدەم ، کـە پێچ و تاوی
بـە ئـاوی چـاوی ، خـۆم بـدەم ئـاوی
لـە ڕێگـەی خـوا کـەینێ ڕەوایە
یە کـێکی تـر بی و بگرێ گـولاوی ؟

### لوڕی

ئـان کـەبی خـان و بی مـانە منم من
ئان کـە بەرگـەشـتـە سـامـانە منم ، من
ئـان کـەشـامـان بەئەندوە مـیکەرەروز
ئـان کـە روزەش چو شـامـانە منم من

### سۆرانی

ئەوەی کـەبەبێ خـان و مـانە مـنـم
ئەوەی دوور لـە سـامـان و نـانە منم
ئەوەی شـەو بە ئەندۆ دەگـەیێنێـتـە ڕۆژ
ئـەوەی ڕۆژی هـەر وەک شـەوانـە مـنـم

**لوڕی**

دو چەشـــمـــونەت پیـــالە پر ز مـــەی بی
دوزولفـــونت خـــەراجی مـــولکی رەی بی
هەمی وەعـــدە کـــەری ئیـــمـــرۆز و فـــەردا
نزونەم مـــو کـــە فـــەردایی تـوکـــەی بی ؟

**سۆرانی**

دووچاوت پـیـــــالـەی لە بـالەب مــــــەیە
دووزولـفـت خــــــــــەراجـی ولاتـی رەیـە
هەمـــوودەم دەدەی وەعـدی ئەمـرۆ سـبـەی
خـــودی ئەز نزانم ســـــبـــــەی تەکـــەیە ؟

## دەوڵەمەند کردنی
## (گونجینە)
### بە کۆمەڵە گەوهەرێکی تری بابا تاهیر

برایانم خوێنەرانی خۆشەویست !

دەمێکە شەیدای شیعرە پڕلە سۆز و گودازەکانی باباتاهیر بووم ، کە شاعیر و فەیلەسوف و قە لەندەر مەشرەبێکی زۆر پاک و پیرۆز بووە وبەر لە هەزار ساڵ لە ناوچەی هەمەندا ، لە دۆڵ و قەد پاڵ و ملە و لووتکەی کێوەکانی (ئەڵوەند و مەیمەن) دا ژیاوە و جوان بە هەلاڵەی کۆهساران ، وەنەوشەی جۆیە باران ، بەفر وبا و باران ، چڵ و گوڵ و بولبول و سروشتی جوانی کوردستانیدا هەڵداوە و دڵدارێکی راستەقینە بووە .

ئەوەی جێی سرنجە ئەمەیە : کە یەکەمشاعیری کوردە دوای لە ناوبردنی کلتووری میدی و پەهلەوی ، کە نەژادی نزیکی کورد بوون و ئیستا جگە لەوەی کەماویشە فارسەکان دەستیان بەسەرداگرتووە و کردوویانە بە کلتووری خۆیان

بەڵی یەکەمین شاعیری کوردە کە دوای ئەو هەموو کارەساتە ، شیعری تۆمارکرابی و بەو جوانی و پڕمانایی و سۆز و جۆش و خرۆشەوە بۆ مە مابێتەوە .

جائەمە ئەوە دەگەیێنێ کە کورد بەر لە باباتاهیریش خاوەنی کەلتورێکی پوخت و پێگەیشتوو بووە و باباتاهیریش پەرەپێدەری بووە و فەلسەفەکەشی سەربەخۆبە و وەک ئەوەی خەیام نییە کەدەڵێن لە (ئیبن سینا )ی وەرگرتووە و سەد ساڵێش) دوای باباتاهیر هاتووە .

بەلای منەوە دەبی نەتەوەی کورد ، بە تایبەت ئەدیب و رووناکبیرەکانی گرنگییەکی زۆر بە شیعری و بیری باباتاهیر بدەن و بە دەیان نووسین و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و شیعرەکانی شیبکەنەوە .

لە ساڵی ١٩٥٧ دا حەفتاوحەفت چوارینم وەرگێرایە سەر شێوەی کرمانجی خواوو(سۆرانی) کە لەم گەنجینەیەدا لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٠ دا چاپکرا و لە سەردتای هاوینی ١٩٧٧ یش ، لە هەولێر (٣١) دووبەیتی (چوارین)ی تریم کردە سۆرانی و لە ساڵی ١٩٧٨ دا لە گۆڤاری (نووسەری نوی) دا بلاوکرایەوە .ئیستا ژمارەی چوارینەکانی ئەم چاپی دووەمە دەبی بە (١٠٨) چوارین یان دووبەیتی .

شایانی باسە ئەمەیش بڵێم : کە نەک هەر لە ماناى دووبەیتییەکان دوورنەکەوتوومەتەوە و بەس بەڵکو زۆربەی وشەکانیشم هەروەکو خۆیان هێشتونەتەوە .

من نەهاتووم گەوهەرەکانی شیعری باباتاهیر بتوێنمەوە و دایان ڕێژمەوە ، بەڵکو ئەوەی ئەمن کردوومە تەنیا ئەوەیە کە گەردی گەوهەرەکانیم سڕینەتەوە و بریقەدار و نمایانم کردوونەتەوە بۆ خوێنەرانی دایلەکتی سۆرانی و بەس . بۆ ڕاستی قسەکانیشم فەرموون ئەم دوو بەیتە بخوێنەوە ، داخوا لە دووسی وشە پتر دەسکاری کراوە ؟

مەگەر شێر و پلەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ
لەگەڵ مندا لە جەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ
ئەگەردەستم بگا خوێنت دەڕێژم
ببینم تاچ ڕەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ

هەروەها هەندی وشەی عەرەبی تێدا دەبیتن ، ئەمانە هی من نین هی باباتاهیرن ، لە گەڵ ئەمەشدا لە کەموکورتیم ببورن ، چونکە هیچ کارێک بێ کەموکورتی نابێ .

لەگەڵ سڵاوی دڵسۆزانەمدا

**دلزار**

**ستۆکهۆلم** ٨-٨- ١٩٩١

**لوڕی**

سەرم چون گویی دەر مەیدان بگەردە
دلم نەزعەهد و نەز پەیمان بگەردە
ئەگەر دەوران بە نامەردان بمونە
نشینەم تا دیگەر دەوران بگەردە

**سۆرانی**

ســـەرم دەرکـــەوی وەک گـــۆ لە مـــەیدان
دڵـم لانـادا لـە عـــــــەهـد و پـەیمـان
گـــــــەربـە نـامـــــــەردان دەوران بمێـنـی
دادەنـیــــــــشم تـا دیـتـــــــەوە دەوران

**لوڕی**

ســحــرگــاهان کــە بولبــول بەر گــول ئائی
ئەشک برچشم بە دامــان گــول گــول ئائی
رەوەم دەر پایی گــول ئەفــغــان کــرم ســەر
کــەهەر ســوتە دلی دەر غـــولغـــول ئائی

**سۆرانی**

بەیانیـــان کـــەوا بولبـــول بۆ گـــوڵ دێ
فرمێسک لە چاومابە کوڵ گوڵ گوڵ دێ
دچمــــە دەوری گـــــوڵ تـی دەچریـکـێـنم
هەر دلســوتاویک جــا بە غــول غــول دێ .

**لوڕی**

عــەزیزا کــاســەئی چەشــم ســەرایەت
مــیــانی هەردوو چەشــم خــاکی پایەت
ئەز ئان ترســەم کــە غـــافل پانەهی باز
نشــینەد خــاری مـــوژگـــانەم بە پایەت

**سۆرانی**

ئازیزم کـــاســـەی ، چاوی منە جـــێت
بەینی دوو چاومـــە ، خـــاکی بەری پێت
دەتـرسـم لـەوەی غـــــافـل پیێ بـنـێـی
دڕکی برژانگم ، بنیـــشـــێـتـــە پێت

**لوڕی**

مـوسـولمانان سـە دەرد ئامـو بە یەکـجـار
غـــەریبی یو ئەسـیـــر بیـــو غـــەمی یار
غـــەریبی یو ئەســیـــری ســـەهل وایو
غـەمی یار مـوشکلە تا چون شـەوەد کـار

**سۆرانی**

یاران سی دەردم هەیە بە یەکـــجـــار
غـــەریبی و دیلی و غـــەم و تاڵی یار
غـــەریبی و دیلی نەیـســا ئاســـانن
غـەمی یار سـەخـتـە هەتا پێکدی کـار

**لوڕی**

مو ئان ئەسپـیـدە بازەم سـینە سـوهان (١)
چرا گـاهی مـوبی سـەر بە شنی کـوهان
هەمـە تیـغی بە سـوهان مـیکەرەن تیـز
مـو ئان تیـغـەم کـە یەزدان کـردە سـوهان

---

(١) سوهان : بربەندە ، من کردومەتە هەسان ، هەردووکیشیان تیغ تیژدەکەن

### سۆرانی

ئەمن ئەو بازە ، سپـیـەم سنگ هەسـان
لەوەرگـــاهمـــە ، کـــلاوەی کـــەژان
بە هەسـان هەمـوو ، تیـغی تیـژەکـەن
ئەو تیـغـەم کـە خـوا ، کـردی بە هەسـان !

### لوڕی

بەسـەر غـەیری تە سـەودائی نەدیرەم
بە دل جـزتەتەمـەنـائی نەدیرەم
خـدا زوونە کـە دەر بازاری عـیـشـقت
بە جـز جـون هیچ کـالائی نەدیرەم

### سۆرانی

غـەیری تۆ نیـمـە ، لەسـەر سـەودایەک
لە دلّدا نیـمـە هیچ تەمـەنـنایەک
خـودا دەیزانی ، لە بازاری عـیـشق
غـەیری گـیـان هەرگـیـز نیـمـە کـالایەک

### لوڕی

هەر ئان باغی کـە نەخلش سـەربەدەر بی
مـادامـەش باغـبـون خـونین جگەر بی
ببـایـد کـەندەنەش ئەز بیخ و ئەز بن
ئەگـەر بارەش هەمـە لەعل و گـوهەر بی

### سۆرانی

هەر باغی سـەولّی کـە سـەربەدەر بی
مـادام باخـەوان خـوێنین جگەر بی
دەبی هەڵکـەنری ، لە بێخ و لە بەن
گـەر بەری هەمـووی لەعل و گـوهەر بی

**لوڕی**

مـن ئون مـــسكينی بی قــەدر و بەرەســتم
من ئـون سـوزەنده شـەمـعی بی سـەرەسـتم
نه كـــاری ئاخـــرەت نه كـــاری دنيـــا
مـن ئـون خـــشكنده نەخلی بی بەرەســـتم

**سۆرانی**

مـن ئـەو هـەژاره بێـــــڕێـز و فــــــەرەم
مـن ئەو ســـووتاوه مـــۆمـــه بێـــســـەرەم
نـەكــــاری دونـيـــــا نه هی ئاخــــرەت
مـن ئەو درەخـــــتـــه وشـكه بێـــبـــەرەم

**لوڕی**

بـوره يـەک شـــــــەو مـنـەوەركـن و تـاقـم
مـــهـل دەر مـــحنەت و دەردی فـــيـــراقم
بە تاقی جـفــتی ئەبرويی تو سـەوگـەند
كــه مــو جــفــتی غـــەمم تا ئەز تو تاقم

**سۆرانی**

وەره رۆشـن كـــــــه ، شـــــــەوی وەتـاقـم
وەرسـی مـــــەينەت و دەردی فـــيـــــراقم
بە تاقی جـــووتـه ئەبرۆی تۆ قــــەســــەم
مـن جـــــووتـی غـــــەمم ، تا لـه تۆ تـاقـم

**لوڕی**

بی تـه يـەكـــدەم دلم خـــورەم نـەمــــونه
وەگـــەر روويی تـه وينم غـــەم نەمـــونه
ئەگــەر دەردی دلم قـــيـــســـمـــەت نمايەند
دلـی بی دەرد دەر عــــالـەم نـەمـــونه

**سۆرانی**

لە دڵــمـــــا بی تۆ خـــــورەم نامـــــێنی
رووی تۆ ببـــــینم چ غــــەم نامـــــێنی
گـــــەر دڵم بەشی لە غـــــەم نەمـــــێنی
دڵ بی دەرد لە گـــشت عـــالەم نامـــێنی

**لوڕی**

مـــەرا نە ســـەر نە ســـامـــان ئافـــەریدەند
پەریشـــــانم پەریشــــان ئافـــــەریدەند
پەریشـــان خـــاتران رەفـــتـــەند دەر خـــاک
مـــەرا ئەز خـــاک ئیـــشـــان ئافـــەریدەند

**سۆرانی**

من بەبی ســـەر و ســـامـــان خـــوڵقـــاوم
پەرتو پەرێشـــان گـــیـــان خـــولقـــاوم
دڵ پەرێشـــانان رۆیشـــتنە ژێر خـــاک
من لە خـــاکـــەکـــەی ئەوان خـــوڵقـــاوم

**لوڕی**

لالەکـــــاران دیگەر لالە مـــــەکـــــارید
باغـــــەبانان دو دەست ئەز گـــــول بدارید
ئەگ ر عـــەهدی گـــولان ئین بو کـــە دیدەم
بیـــخی گـــول بەر کـــەنیـــد و خـــار بکارید!

**سۆرانی**

ئـەی لالـە چـیـنـان ، لالـە مـــــــــەچێـن
باغـــــەوانان واز ، لە گــــــولّ بهـــێـن
پـەیمانـی گـــــــوڵان ، ئـەودبی کـــــە دیم
گـــولّ ریشـــەکـــێـــشکەن ، دڕک بچـــێـن!

### لوڕی

مــو کــه مــهست ئهز مــهیی ئهنگور باشــهم
چــرا ئــهز نــازەنــیــنــم دور بــاشــــــــــهم
مـــو کـــه ئهزئاتهشت گـــهرمی نهوینم
چرا ئهز دود مـــحنت کـــور باشـــهم ؟

### سۆرانی

من کــه ســهرمــهســتی شــهرابی ســوور بم
بــۆچــی لــه یــاری نــازدار بــهدوور بم
گـــهر له ئاگـــرت گـــهرمی نهبینم
بۆ به دووکـــــــهڵت دیده بی نوور بم ؟

### لوڕی

شــهوان ئهســتــارەگــان یهک یهک شــومــارەم
بوه نیـــمـــه شـــهوان گـــوش وا ته دارەم
پس ئهز نیـــمــه شــهوان کــه ته نیــائی
بـــورانـــی ئــهشــک ئــهز دیــده بــبــــــــارەم

### سۆرانی

یهک یهک دەژمــێــرم ، شــهوان ئهســتــێــران
بوو به نیـــوەشــهو ، گــوێت لێدەگــرم جــوان
پاشی نیـــوەشـــهو ، کـــه ههر نههاتی
ئهســــــــریـن دەرێژم ، وەک تــاوی بــاران

### لوڕی

فـــــهلــهک زار و نزارم کـــــهردی ئــاخـــــر
جـــودا ئهز گـــولعـــوزارم کـــهردی ئاخـــر
مـــیـــانی تهخـــتـــهیی نهردم نیـــشـــاندی
شـــهش و بیـــجی به کـــارم کـــهردی ئاخـــر

**سۆرانی**

فــــەلەک زار و نیـــزارت کـــردم ئاخـــر
جـــودا لە گـــولعـــوزارت کـــردم ئاخـــر
لە نێـــوان تەخـــتی یاری نەردت دانام
بە شـــەش بێـــشێ لە کـــارت کـــردم ئاخـــر

**لوڕی**

تونی لەو شـــەککەرین و یاســـمین بەر
مـــوئان تەن ئازەرینم دیدەگـــان تەر
ئەز ئان ترسی دەر ئاغـــوشم بیـــائی
کـــز ئازەرســـیم گـــودازە ز ئاب شـــەککەر

**سۆرانی**

ئەتۆی لێـــو شـەکری خـاو و یاسـەمین بەر
مـن ئەو لەش ئـاگـــرینەم چاو نمین تەڕ
دەترسـیت بێـــیتـــە باوەش من نەبادا
لە ئاگـــر زیو لە ئاو توونابی شـــەککەر

**لوڕی**

مـــوکـــە ســـەر دەر بیـــا بونم شـــەو ورۆز
ســـروشک ئەز دیدە بارونەم شـــەو و رۆز
نە تەب دیرەم نە جـــایەم مـــیکوند دەرد
هەمـــیـــدونەم کـــە نالونەم شـــەو و رۆز

**سۆرانی**

ئەمـن ســـەر لە بیـــابانم شـــەو و ڕۆژ
لـە چاوا ئـەشـک بـارانم شـــەو و ڕۆژ
نە تـام دێتی نە جـــیـــێـــەکم دێشی
دەزانم هـەر لـە نـالانم شـــەو و ڕۆژ

### لوڕی

غـەمی دەردی مـو ئەز عـەتتـار مـیـپـرس
درازی شـــەو ئەز بیـــمـــار مـــیـــپـــرس
خـــەلایق جـسـملەگی ئەحـــوال پرســـەند
تە کـە جـان و دلی یەکـبـار.مـیـپـرس

### سۆرانی

غـــەمی دەردم لە عـــەتـتـــاریٚ بپـــرســـە
دریٚژی شـــەو لە بیـــمـــاریٚ بپـــرســـە
خەڵک تێکرا هەمـوو پرسـیـان لە حـاڵم
کـــە تۆ گـــیـــان و دڵی جـاریٚ بپـرســـە

### لوڕی

دلـــــم زار و دلـــــم زار و دلـــــم زار
تەبیـــــبم ئاوەرید ، دەردم کـــەرید چار
تـەبیـــــبم چـون بـوینـە بـەر مـــــوی زار
کـــــرە دەرمـــــونـی دەردم را بـەنـاچار

### سۆرانی

دڵـــــم زارە دڵـــــم زارە دڵـــــم زار
پـزیـشـکـم هـات کـــــەوا دەردم بـکـا چـار
پزیشـکی من کـە دی وا من خـەفـەتـبـار
دەوای دەردی ئیـــتـــر کـــردم بە ناچار

### لوڕی

خـوش ئان روزی کـە قـەبرم مـیگـیـرە تەنگ
بە بالـینی سـەرم خـشـت و گل و سـەنگ
دوپا دەر قـــیـــبلە و وجـــان دەر بیـــابان
تەنم با مـــار و مـــوران مـــیکەرە جـەنگ

**سۆرانی**

خـۆشـــە ئەو رۆژە گــۆڕم هەڵدەنێن تەنگ
سەرینی ژێر سـەرم خشـتـە ، گڵ و سـەنگ
دوو پێم روویان لە قـیبلە و گـیـان لە چۆڵی
لەشم دژ مـار و مـێـروسـتـان دەکـا جـەنگ

**لوری**

وای ئانروزی کـــە دەر گـــورم کـــرن تەنگ
وەرێژن بەر سـەرم خـاک و خـەس و سـەنگ
نە پای ئانکی نەز مـــــاران گـــــریـزەم
نە دەست ئانکی با مـــوران کـــونەم جـەنگ

**سۆرانی**

وای لەو رۆژەی کـە گـۆڕی من دەکەن تەنگ
بەسـەرمـا دادەکـەن خـاک و چەو و سـەنگ
نە پێی راکـــــردنم هەس مـن لە مـــــاران
نە دەسـتم هەس لەگەڵ کـرمـان بکەم جەنگ

**لوری**

کـە شـەم ئاهی کـە گـەردون با خـەبەر شی
دلـی دیـوانـەئـەم ، دیـوانـە تـر شـی
بتــــرس ئەز ســـوزی ئاهی ســـوتە دلان
کـــە ئاهی ســـوتە دلان کـــارگـــەر شی

**سۆرانی**

دەکــێـــشم ئاهێ گـەردون با خـــەبەر بێ
دڵەی دێـوانـەکــــــــــەم دێـوانـە تـر بێ
لە ســـۆزی ئاهی دڵســـوتان بتـرســـە
کـــە ئاهی دڵســـوتاوان کـــاریگەر بێ

### لوری

بەهار ئامـــەد بە سـەحـــرا و دەرد و دەشت
جـــــەوانی هەم بەهاری بود و بگوزەشت
ســــەری قـــەبری جـــەوانان لالە رویە
دەمی کە مەهوەشـان ئایین بە گـوڵ گەشت

### سۆرانی

بەهار هات بۆ زەویوزار و دەر و دەشت
بەهارێ بوو جحێلیش هات و رۆیشت
لەسەر گۆری جحێلان لالە دەڕوێ
دەمی ، کە نازەنینان دێنە گوڵ گەشت

### لوری

برەندەم هەمـــچـــو یوسف گـــەر بە زیندان
وەیا نالەم زوغـــەم چون مـوســتـــەمـــەندان
ئەگـــەر صـــەد باغـــەبان خـەســمی نمایەد
مـــــودام ئایەم بە گــــولزاری تو خـــەندان

### سۆرانی

وەکـــو یوسف ئەگـــەر بخـــرێمـــە زیندان
بناڵێنم وەیا وەک مـــوســــتـــەمـــەندان
ئەگـــەر ســـەد باخـــەوانیش دوژمنم بن
مـــادامکی دێمــە باخت شـادم ، خـەندان

### لوری

بە دل نەقـــشی خـــەیالت دەر شـــەبی تار
خـەیالی خـەت و خـــالت دەر شـــەبی تار
مـــژە گـــەردەم بە گــــەردی دیدە پر چین
کــــەتاوینم جــەمـــالت دەر شـــەبی تار

**سۆرانی**

له دڵ نەخشـــه خـــەیاڵت له شـــەوی تار
خـــەیاڵی خـــەت و خـــاڵت له شـــەوی تار
مـــوژه زوو زوو له دەوری چاو دەگـــێـــڕم
ببـــینم تا جـــەمـــاڵت له شـــەوی تار

**لوری**

حـــــەرامم بی ته بو ، ئا لاله و گـــــول
حـــــەرامم بی ته بو ، ئاوازی بولبـــــول
حـــەرامم بی ئەگـــەر بی ته نشـــینم
که شەم دەرپایی گول بن ساغری مل (١)

**سۆرانی**

بەبی تۆ لێم حـــــەرام بی لاله و گـــــوڵ
بەبی تۆ لێم حـــەرام بی دەنگی بولبـــول
حـــــەرام بی لێم به بی تۆ دابنیـــــشم
له پای گـولبـەن (٢) بنۆشم پیـالەیی مل

**لوری**

بوره ســـــوته دلا تا مـــــا بنالیم
بیـــــا پەروانه با مـــــا تا بنالینم
زو عـــیـــشـــقی ئان گـــولی رەعنا بنالیم
زو دەســـــــتی یاری بی پەروا بنالیم

---

(١) مل : شەراب . (٢) گول بن: بنکه گوڵ ، درەختی گوڵ ، بنه گوڵ.

**سورانی**

وەرە ئەی دڵ سووتاو پێکرا بناڵێن
وەرە پەروانە تو خوا با بناڵین
لە عیشقی شا گوڵی رەعنا بناڵین
لە دەستی یاری بی پەروا بناڵین

**لوری**

جگەر پر دەرد تاکەی ئایەم و شم
ز وصلت فەرد تاکەی ئایەم و شم
چرا گوئی دەری کویەم نیائی
مو تاکەی با روخی زەرد ئایەم و شم؟

**سۆرانی**

جگەر پڕ دەرد ، هەتا کەی هاتوچۆکەم
بەتەنیا فەرد ، هەتا کەی هاتوچۆکەم
ئیتر بۆچی دەڵێی نایەیتە ماڵم
بە روویی زەرد ، هەتا کەی هاتوچۆکەم؟

**لوری**

تو خود گفتی کە مو مەلاحی مانم
بە ئابی دیدەگان کەشتی برانم
هەمی ترسەم کە کەشتی غەرق وابو
دەرئین دەریایی بی پایان بمانم

**سۆرانی**

بەخۆت فەرمووت کە خاوەن کەشتی مانم
بە ئاوی چاوەکان کەشتی دەرانم
دەترسم زۆر کەوا کەشتی نقوم بی
لە ئەم دەریایە بی ، خەمی ژیانم

### لوری

دلی دیرەم چو مرغی پا شکستە
چو کەشتی بەر لەبی دەریا نشستە
هەمە گویەن کە تاهیر تار بنواز
سەدا چون میدەهەد تاری گوستە

### سۆرانی

دڵێکم هەیە وەک ، مەلی پی شکاو
وەکو کەشتی لێو بەحری نشتوی لماو
هەموو هەر دەڵێن لێدە تاهیر لە تار
سەدا چون دەدا ئاخۆ تاری پساو؟

### لوری

هەمە بەندی تەنەم مانەندی نەی بی
مدامەم دەردی هجرانت زوپەی بی
مەرا سوز و گودازە تا قیامەت
خدا زونە قیامەت تا بەکەی بی!

### سۆرانی

هەموو بەند و جومگەی لەشم وەک نەیە
مەدام دەردی دووریت لە دووما هەیە
ئەمن تا قیامەت دەسووتێم بە تاو
خودا خۆی دەزانی قیامەت کەیە!

هەولێر
١٩٧٧/٦/٣٠

(تیـــلـّـــه) لەشــــه (ئیـــمـــیـــا) ناوه
(گـــــەلـّەڤـــا) ســــەره (گـــلاز) چاوه
(ئـووخــــــــه) گـــــــویێـیـه (زووب) ددانـه
(رووکـــا) دەســــتـــــه (پلیــــچــــۆ) شـــانه
(گـــۆرلـّـه) گـــەرووو (شـــێـــیـــا) ملـه
(رۆزا) گـــــولـّه (ڤـــــێـــــتکه) چلـّـــــه
(بـەڕان) بـەرانـه (لـیــــــســــــا) رێـوی
(گــــۆڕنی کــــازیـۆل) بزنه کـــــێــــوی
(خـلـیّـب) نـانــه (ڤـــــــــــەدا) ئـاوه
(ژارنـی) برژاو (ســــــیـــــرۆی) خـــــاوه
(ســـیـــســـتــــرا) خـــوشکه (براتو) برایه
(ئـەتیـــــــتس)و (مــــــات) بـابـەو دایـه
(دیـادیـا) مـــــــامــــــه (دیـادیـا) خــــالـّه
(ســـلاتـکی) شـــیـــریـن (گـــورگی) تـالـّه
(دەرۆگـــــه) رێ، (مــــێـــســـتــــه) جێیه
(لآن) بـــەرووســـی ئـــاســـکـــی مــێـیــه
(شـــــیـــــرۆکـی) پان (ئـۆزکـی) تـەسکه
(ناڤـــووز) زبلـّـــه، (مــــیـــتـــلا) گــەسکه
وتـەی (دیـدووشـکـا) بـاپـیـــــــــــــره
بـەلآم (بـابـووشـکـا) داپـیـــــــــــــره
(مـــــاســـــلا) کـــــەرەو زەیـت و رۆنـه
(ڤـکـووس) تـامـــــــــــه (زاپـاخ) بـۆنـه
(دووخ) بەرووسی رۆحـــــه گـــیـــانـه
(دووخی) عـــەتره، (شـــاخـتـــا) کـــانه
(رێـکـا) رووبـار (گـــــەڕا) کـــــێـــــوه
(ڤـــــۆر) دزه دز (دیـاڤـــــــەل) دێـوه
(کـــۆگــــەت) چرنووک، (نۆگــــەت) نینـۆک
(ســکـووپـۆی) واتــا رژدو قـــــــــرچـۆک

(گرووت) مەمکە، (گرووت) سینگە
(نەگا) پێیە (نەگا) لینگە
(زیما) زستان (زیما) مارە
(کارمن) بەرد (دیریڤە) دارە
(چەلەڤیک) ئینسان، (چەلەڤێک) پیاوە
(مالچیک) منداڵ، (مەڵەدۆی) لاوە
(ساخەر) شەکرە (چای) هەر چایە
(سنێگ) بەفرە، (ڤێتر) بایە
(زیملا) زەوی (سۆنتسێ) خۆرە
مایەی ژینن سوودیان زۆرە
(ڵووک) پیوازە (ڵووک) کەوانە
(ڵوونا) مانگی گەش و جوانە
( میر ) گەردوونە ، (میر) گێتی یە
(میر) مەسرەتە ، ( میر ) ئاشتی یە
(سمێرت) مردن (ژیزن) ژینە
(ڤەینا) شەڕە ( زلۆبا ) قینە
(ڤۆلەس) مووە (لیستۆ) رووە
(ئەدین) یەکە (دڤا) دووە
(ژیڤۆت) زگە ، (گوبی) لێوە
(فۆرما) چیە ؟ شکل و شێوە
(چۆما ) تاعوون ( چۆما ) دەردە
(پیل) تۆزو گەرد (خۆڵەد) سەردە
(بیلی) سپی ، (چۆرنی) رەشە
(کراسنی) سوورێکی زۆر گەشە
( زلیۆنی) سەوز (سینی) شینە
(ژۆلتی) زەردە ، رەنگ زێرینە
(کیست) لەپی دەست (کیست) هێشووە
(ژیلیزا) غوددەیە ، لووە

(پـــۆزنـــــه ) درەنـــــگــــــه ، (رانــــــه) زووه ،
(ژنا ) ژنه ( مـــــووژ) مـــــێـــــرد ، شـــــووه .
(زاپاد) غـــــەریە ( ڤـــاســـــتـــــۆک) خــــاوەر
(یوگ) باشـــووره ( ســـــیــــڤــــەر) لای ســــەر
(گـــــــۆرەد) شــــــــاره ( دیـنـگـی ) پـاره
( زاپـۆت ) کــــــارگــــــەر ، ( ترووود) کــــــاره
(لاپـا ) لـەپـه ، هـی ولـّـســــــــــــتـــــــــه
(ئـاشـــــۆشـــــێنیـێ ) هۆش و هـەســـــتـــــه
(ژیدکی) شله (گـــووســـتـــۆی) خـــەســـتـــه
(پیـــــانی) ســـــەرخـــۆش و بەدمـــەســـتـــه
(ســـــاد ) باغـــــچـــــەیه (رای) بەهەشــــتـــه
کــــــەچی (راڤـــــینا ) پـێ دەشـــــــتــــــــه.
(ڤـــــــیـــــــدت) دیـتـی ، (زنـات) زانـــی
( پرۆسـیت ) پرسی ، (ئیـســتــۆک) کـانی
(ســـێـــیـــــات) چاندی ، (پائیت) داشـــتی
(گـــۆلـووپ مـــــیــــرا) کــــوتری ئاشـــتی
(ئاســـیـــــۆل) کـــەره (مــــوول) ئێـــســـتـــره
کـــەچی (ڤـــێـــر بلیـــوود ) حـــوشـــتـــره
( پووت) جــــواناوه ، (مـــۆچا) مـــــیــــــزه
(گـــۆردەست) فـــەخـــرو دەعـــیـــەو فـــیـــزه
(ســـامکا) مێ یه ، (ســـامـــێـــتس) نێـــره
(ســـــیــــڤــــینیـــا ) بەرازه ( لیڤ) شــــێــــره
(ســـڤـــیـــتـــۆک) گـــوڵه (ســـڤـــێت) رەنگه
(گـــۆلەس) دەنگه ، (پـچـــێــــلا) هەنگه
(کــــرۆڤ) خـــوێنه ، ·کــــرافـــات) نوێنه
(خـــفـــالا) مــــەدحـــه ، (رووگـــەن) جـــوێنه
(گلوو خـــۆی) کـــەرِه ، (تـیـــمـــۆی) لاڵه
(خــــــۆڵم) گــــــرده ، (یامـــــــا ) چاڵه

( پیـــجـــاڵ) غـــەمـــە ، (توومـــــان) تەمـــە
(ئـیــــپـــــۆخـــــا ) چاخ و ســــەردەمـــە
(منـیّ ژارکــــــە ) مـن گــــــەرمـــــامـــــە
(منیّ) خـــــۆلەدنە)من ســــەرمـــامـــە
(ســـەباکـــە) ســـەگ ، (ڤـــۆلک) گـــورگـــە
(بـیـک) گــــــایـە (ژێـلـوو دەک) ورگـــــە
(ئـاگــــــون) ئـاگــــــر ( ڤـــــــۆزدووخ) بـایـە
(ئـاد) دۆزەخ ، (مـــــــــــــۆریّ) دەریـایـە
(ڤـــچـــۆم دیّلــــە؟) خـــەبەر چیـــیـــە ؟
(نیـــچـــیـــڤـــۆ) چنا هیـچ نیـــیـــە
(زێـر کـــــــــــالـە) راسـت ئـاوێـنـەیـە
(ئـۆپـراز) شـــــــــێـــــــوازە وێـنـەیـە
(ئووم) عـــەقـــڵـــو ژیر، (مـــۆزگ) مـــێـشک
( ســـــامنـینـیّ) گــــــومـــــان و شک
(بـالـتـــــوون) چیـــــیـــــە؟ چەنـە بـازە،
(ســـۆکـــەڵ) چیـــیـــە؟ (ســـەقـــەر) (بـازە)
(ســــــــڤـــــــابـودا) ئـازادی یـە
(رادەسـت) دڵـخـــــــۆشی و شــــــادی یـە
(تـــکـــان) تـــەنـــراو (تـــکـــات) تـــەنـــی ،
(تـکـاچ) جــــــــــۆلایـە ئـەزیـەنـی !
(بـیـــــــدا) بـەلا (بـیـکـوون) راکــــــــەر
(بۆی) مـــــەعـــــرەکـــە و لـێکدان و شـــەڕ
(پـارچـە) قـــــومـــــاش ، (هـەر پـارچـەیـە
(کـــودا) ؟ بۆ کـــویّ ؟ (کـــاگـــدا ؟)کـــەیـە ؟
(بـارێـتـس) مـــــانـای تـێـکـۆشـــــــەرە
( بـرێـتـــــڤـــــە) تـیـــــغـی بـەربـەرە
(زدارۆڤـی) ســــپـــوســـــاغـــــە
(زاپـریـشـــــێـنـیـیّ) راسـت یـاســــاغـــە

(شیولک) ئارمووش (شێرست) خوری
(رێزەت) بڕی (لێتات) فڕی
(شتۆ) چییە (کتۆ) کێیە
(دێرێڤنیە) گوندە ، دێ یە
(یاسنی) سامالّ (تووچە) هەورە
(سلاّبی) لاواز (ژیڕنی) چەورە
(شیپ) درکە ( راسا ) شەونمە
(رۆزا) گولّە ( پێسۆک) لمە
(ڕانە) زووە (ڕانا ) زامە
(رانی ) زامدار خاوەن زامە
(کۆن) ئەسپە (کۆنیوخ)مەیتەرە
(کۆڕم)ئەلف (ئاڤستا )مەڕە
(ڕفات) چنی (ڕفات) بڕی
(رڤات) رشایەوە ، دڕی
(رڤات) مانای تری هەیە
(رڤۆتە) قەی کردنەوەیە
(ستان) قەد بەژن وبالاّیە
(ستان) هەروا لەشکرگایە
(ستان) ماکینەی گەورەیە
(ستاندارت)یش نموونەیە
(مات) دایکە (ماچێخا ) بەلاّم
زڕ دایکە ئێسکی قورسە لاّم
(ئابیزیانە) راست مەیموونە
(ماسلّینا ) داری زەیتوونە
(ئایمان)فێلّ و حیلە وغەشە
(فراگ)دوژمنە بێ بەشە
(سڤێژیێ) تازە و گەشە
(چوڕنی گلازا) چاوی رەشە

(ئیدیالنایا لیوبۆف) کاکه
خۆشویستنێکی بەرز و پاکە
(کۆت) نێره کتکه (میش) مشکه
سکورپیون) دەق دووپشکه
(سووپ) شۆربایه (سووت) کاکڵه
(دووشا ) نەفس و گیان و دڵه
(زۆڵ) بەدییه ، خراپەیه
(زڵۆ) هەمان مانای هەیه
(زڵە)ئەویش هەر وەگ ئەوان
بەدی وخراپەیه و زیان
(زڵۆی) قین لە دڵ وبەده
شەڕانییه ، خۆی لێ مەده
(مۆڵەت) (ئی) (سێرپ) چەکوش وداسە
(ئیزڤیستیا ) دەنگ و باسه
(کارۆن) تاجه ، (ترۆن) عەرش ،
(کیسلی گرانات) هەناری ترش!
(گۆرێ) غەمە (گۆست) میوانه
(گاستینیتسه) میوانخانه
(سمێخ) کەنین ، (پلاچ ) گرین
(ئاکنێڤۆی) واتا ئاگرین
(ئێگلا) دەرزی (نیتکه) دەزوو
(زیات) زاوا ، (تێوشه) خەسوو
دیسان (ئیگۆڵکه) دەرزی یه
(نیزکی) نزم (ڤێس) بەرزی یه
(چووش) هورێنەو قسەی بۆشه
(شووتکه) نکته وقسەی خۆشه
(کازا) بزنه (کازیۆل) نێری
(دایارکه) شیر دوشه ، بێری

(کۆژە) پێستە ، (کۆست) ئێسقانە
(میاسە) گۆشتە باش بیزانە
(تری توو گولنێک) سێ سووچە
(پووت) ڕێگایە ، (پووستۆی) پووچە
(پیرۆ) پەڕە ، (کریلۆ باڵە
بەڵام (پلاتۆک) دەسماڵە
(سێرگا ) گوارە (براسلێت) بازن
جوانی مۆسکۆ زۆر مومتازن !
(موکری) تەڕ ، نمدار ، شێدارە ،
(پراخۆژی) ڕاست ڕێبوارە
(پیتۆخ) چییە ؟ کەڵەشێرە
(خرابری ) ئازا و دلێرە
(خرابرەست) ئازایەتییە
(براتستڤە )برایەتییە
(تونکەست) تەنکی (تونکی) تەنک
(زێلین) سەوزی (زیرنۆ) دەنک
(لوش) درۆیە بەڵام ، (لگوون)
درۆزنە ڕیواو زەبوون
(زامۆک) قوفڵە) ، (کلیۆچ) کلیل
(زامەک) قەسرە (پلێنی) دیل
(پارۆک) عەیب و کورتی و خەوشە
(پەسۆی) بێ خواست (باشماک) کەوشە
(پاچین) چییە ؟ ، دەستپێشخەری
(دیمەن) غوولە (فێیا ) پەری
(فازە) قۆناغ ، (ڤازە) گوڵدان
(کشمیش) کشمیش ، (کارمان ) گیرفان)
(ئووسی) سمێڵ ، (باڕادا) ریش
(بەڕیا) خەبات (رابۆتە) ئیش

(سلیبۆی) کوێر ، (کاسۆی) خێلە
(خرامۆی) شەلە ٠گلۆپی) گێلە
(چاینیک) چادان ، (چاشکا) فنجان
(چودنی) واتا نایاب و جوان
(مێت) مس (ژیلێزە) ئاسنە
(پلووک) بەرووسی گاسنە
(ئاپلۆت میرا) قەلای ئاشتی
(زاکا پیبڤات) واتا ناشتی
(کەمار) چییە ؟ مێشوولەیە
(بابەچکە)راست پەپوولەیە
(بلاخە) کێچە (مووخە) مێشە
(زات) یەعنی پاش ( پێریۆد) پێشە
(گۆلیی) رووت (گالودنی) برسی
(سپراشیڤات) واتا پرسی
( سلۆن) فیلە ، )میدڤێت) ورچە
(نیزریلێ) خاو کاڵ وکرچە
(کراپ) قرژاڵ (ژابە) بۆقە
(بێشتریی بێک) گورگە لۆقە
(مووکا ) ئاردە (مووکە) ئێشە
چووژۆی) غەریب (رادنۆی) خوێشە
(ڤێسنا ) بەهار (ئۆسن) خەزان
(لێتە) هاوین (زیما) زستان
(باسنیە) مانای ئەفسانەیە
(باشنیە) بورجە(کلووب )یانەیە
(پاڤلین) تاوس (ڤازان) پۆرە
(رۆژیو) تفەنگ (سیتکا) تۆرە
دیسان ( ڤینتۆڤگە) تفەنگە
(پووشکە) تۆپە ، (ڤەینا) جەنگە

(مــــاز) بۆباغـــــه) ، (مــــاز) مـــــەرهەمـــــە
(مـــاک) خـــاشــخـــاشـــه (تومـــان) تەمـــە
(کـــفــیـــر) مـــاســـتـــه (ســـیـــڕ) پەنیـــرە
(مـــەلاکـــۆ) شـــیـــر (چیـــسنۆک) ســـیـــرە
(گـــڤـــۆزد) مـــێـــخـــه (گـــڤـــەزدیکە)
مـــێـــخـــەکـــە (سلیـــــوونا) لیکە
(خـــینــه) ، (خـــەنــا) هەر خـــــەنەیە
(ئـۆلـیـــــبـکـــه) زەردە خـــــــەنەیـە
(مـــووتنی) لێـــخن (چیـــســـتـی) روونـە
(نووژدا) نـەبوون (بیـــــتــــیـێ) بـوونـە
(ئـووگـــــڕۆزە) گـــــەف ، هـەڕشـــــەیە
(دیاکـــەن) شـــەمـــاشـــه ، قـــەشـــەیە
(پیــــات) پێنجـــه ( پیـــاد) بســـتـــە
(ژیڤـــۆی) بزۆز (ڤـــیـــالی) ســـســـتـــە
(ژار) گـــەرمـــایە ، (ژارکی) گـــەرمـــە
(ســـتـــیت) شـــەرمـــه (نیـــژنی) نەرمـــە
(گـــەرۆخ) نـۆکـــه ، (ێچـــمین) جـــۆیـە
(ریـس) بـرنج ( خـلـۆیـەک) پـەمـــــۆیـە
(پیـــشـــینیـــتـــســـه) گـــەنمە بەلاٚم
(چیـــچـــیـــڤـــیـــتـــســـه) نیـــسکە برام !
(ئامـــبـڕە) عـەمـبـەر ، (مـوسکـۆس) مـیـسکە
(کـــاســـا) کـــەزی (پریاد) تـیـــسکە
(مـــێـــلـّـــه) ســـابوون ، (پێنه) کـــەفـــە
(بـــەرەبـان) دەهـۆڵ (بـووبـن) دەفـــــــە
(پاتسـیـلـّـووی) مـاچ (لیـووبـۆف) عـیـشـقـە
(پڕاکـــتـــیکا) مـــانای مـــەشـــقـــە
(تســـێل ) ئامـــانج (ڤـــیـــۆ) هەمـــوو
(ژیـلانـیـێ) خـــــــــواسـت و ئـارەزوو

(مـێخ) کـەوڵە (مـۆخ) قـەوزەیە (مـێچ)
شـمشـێرە ( ئیـزگـیب) خـوار و خـێچ
(ڤـینا ) تاوان ، (ڤـینۆ) مـەیە
(ڤـۆن) ئاوازە (دوودکـە) نـەیە
(کـەرەپووس) سـاوای زۆر خـرپنە
(کـۆلێ) گـەردانـەی گـەردنە
(سـاد) گـوڵزارە (سـەلەڤـێی) بلبل
(بوکـێت ئیس رۆز) چەپکێ لە گـوڵ
(پەتۆک) جـۆگـە (پەتۆپ) تۆفـان
(رازلیف) واتا رووبار هەسـتان
(گـریپ) ئـەنـفلـو ئـەنـزەیە
(بۆل) ئیـشـە ، ٠کـاشـیل) کـۆکـەیە
(ڤـێرە) مـوتمانـە و باوەرە
(توومم) قـەزا (ڤـاتووم) قـەدەرە
(بـیگـلـی) هـەڵاتـوو دەربـەدەر
(گـەلەڤـنایا بـۆل) ژانـە سـەر
(سـەلات) کـاهوو ، سـەلاتـەیە
(پەمـیدۆر)یش تـەمـاتـەیە
(خـراپ) پرخـە ، (چۆخ) پشـمـینە
(خـۆخـەت) قـاقـای پێکەنینە

(کـەسـتـیـۆم) قـاتە (ئوتیـوک) ئوتی
(سـتـەیات) هەسـتـا (سکەزال) گـوتی
(ڤـێک) سـەد سـالە (ڤـیکی) بەڵام
هـەردوو پێـلـووی چاوە برام
(بازار) (یـارمـارکـە) هـەر یـەکـن
شـوێن کـرینی شـتـومـەکن
(رینـۆک) ئـەویـش هـەروەک ئـەوان

بازارە تا حەزکەی جوان
(ڤیێس) قورسایی (ڤیێسی) قورس
(بەیازن) بە رووسی ترس
بە رووسی (ئوسپە) ئاولەیە
(کۆر) نەخۆشی سووریێژەیە
(ڤینەگرادنیک) داری میوە
(یابلەنیا) دەق داری سێوە
(شیلکە ڤیتسا) داری تووە
(دووپ) دار مازوو یان بەڕووە
(بیریۆزە) دار بە توولایە
وەک عەرعەر بەرزو بالایە
(شتۆ) چییە ، (چیڤۆ) چییە
(دووڕاک) گەوجە ، (دوور) گەوجییە
(پلاتان) (چینارە) هەر چنارە
(کەمیش) قەمیشی ناودارە
(لیولکە) لانک ، (سورمە) کلە
(مالنکی) چووک (بەلشۆی) زلە
(چوو) گوێ بگرە (تێن) سایەیە
(گەپیتال)یش سەرمایەیە
(لیپە) داری زەیزەفوونە
کەچی (ماسلینا) زەیتوونە
(سەسنا) سنەوبەری بەرزە
(کیدر) داری جوانی ئەرزە
(بەخچا) بێستانی شووتییە
(پەپووگای) ناوی تووتییە
(لیوخکی) سی یە · (پێچین) جەرگە
(ێدا) خواردن (پلاتیێ) بەرگە
(ئۆمیڕات) مردن (ژیزن) ژیان

(مۆرە) قەپۆز (میژدوو) نێوان
(ئاسیۆل) کەرە ، (گلووخۆی) کەرە
(ئۆفتسی) مەرە ( موکری) تەرە
(ڤەینا) شەرە (لای) سەگوەرە !
(خودۆی) لەرە (پیرۆ) پەرە .
(ژیلێزە) ئاسن ، (ستال) پۆلایە
(تکان) تەنینە ، (تکاچ) جۆلایە
(بازار) بازارە (تەڤار) کالایە
(سترانا) ولات (فلاگ) ئالایە
(بۆخ) خوداوەندە (ئەللاخ) ئەللایە
(مێچێت) مزگەوتە (موللا) مەلایە
( بیدنی) هەژارو (بیدا) بەلایە
(ستان) لەشکرگا (ستان) بالایە
(دێربقە) دارە ( لیستڤا) گەلایە
(سڤیتۆک) گولە (تراڤا) گیایە
(راڤینا) دەشتە (گەرا) چیایە
(سووشە) وشکانی (موری) دەریایە
(سەلۆما) پووشە (سەلۆما) کایە
(ڤێربلیود) حوشتر(بیک) مانای گایە
(زنا نیێ) زانین ( زناتۆک) زانایە
(ئۆمنی) زیرەک وئاقڵ ودانایە
(مراک) تاریکی (لامپە) لامپایە
(سڤێت) رووناکی (سڤێت) دنیایە
(نێبە) ئاسمانە (ڤازدۆخ) هەوایە
(بووریا) گەردەلول یان رەشەبایە
(کەرۆڤە) مانگا (کارۆڵ) پاشایە
(تێوشە) خەسوو (زیات) زاوایە
(سین) کورە (دۆچ) کچ (برات) برایە

(ریبێونەک) کۆرپەی وردو ساوایە
( میر ) ئاشتی یە ( میر ) گێتی و دنیایە
((کۆسمەس) گەردوونە (گۆسمەس) فەزایە
(کریێ پەست) قایم (کریێ پەست) قەڵایە
(رۆدینا ) وەتەن ، ئای کە هێژایە !
(ڤراگ) دوژمنە ، لە خاکماندایە
(نارۆد) میللەتە ، زۆر نارەزایە
(باریتس) تێکۆشەر (خرابری) ئازایە
(ترودنی) زەحمەتە ، (لیۆخکی) سانایە
(سڤیا تۆی) قەدیس (پاپە) پاپایە
(خرام) پەرستگا ، یان کلێسایە
(میدلینی) سستە ، (سگۆرێ) خێرایە
(شووم) دەنگە دەنگ و هەروا هوریایە
(نیڤێستا ) بووکە ، سەر بە تارایە
(ژنیخ) خاوەن بووک ، تازە زاوایە
(رابۆچی) کارگەر (ماستێر) وەستایە
(بیلی) ئاینە (فێرە) بروایە
(دار) دیارییە (دڤێر) دەرگایە
(کاردڤان سەرای) کاروان سەرایە
(میسل) فیکرەیە (مینینیێ) رایە
(دۆم) خانوو ماڵە ، (پریۆت) مەئوایە
(سڤودنیا ژارکە) ئەمرۆ گەرمایە
(سڤودنیا خۆ لەدنە) ئەمرۆ سەرمایە
(بەرەبان) دەهۆڵە ( فلیێتا ) نایە
(میندال) بادەمە (فینیک) خورمایە
(مووژیک) لادێیی ، (بارێن) ئاغایە
(شێرست) بەرگن و خوری و لووایە
(پووستینیا ) چییە ؟ چۆڵ و سارایە

(فـــيـــزيكا) دياره عـــيلمی فـــيـــزيايه
(كـــەرەتكی) واتا: كـــورت و كـــۆتايه
(پرســـــبـــــا) داواو تكاو رجـــــايه
(پانتـــار) كـــەهرەمـــان يان كـــارەبايه
(ئيگله) دەرزيـــــه (نيـــــتكه)هەودايه
ئيـــــتـــــر با بەس بێ ، ئەمــــه دەريايه
بەلێ هەڵينجـــــان كـــــۆتايی نايه .
(سـڤـه بۆدنی) ئازاد ، (تسـێل) ئامـانجـه
(ژيلانيێ) ئاوات ، (كـــەرۆنه) تانجــــه
(ئووتراته) زيان ، (دەخـــۆد) قـــازانجــه
(پەخفـەلا) مـەدحـه ، ( پرۆتێـست) توانجـه
(شـــيـــرينا) پانی ( شـــيـــرۆكی) پانه
(شـيـپـۆڤنيك) دارو گـولی شـيـلانه
(زيمچـۆک) مـرواری (كـەرال) مـەرجـانه
(پەئێـزيا) شـيـعـر ، (پرۆزه) پەخـشـانه
(گـەرِبوون) قـەمـبووره (گـووسـاک) نێـرەقـاز
(گـووبكه) ئيسفـەنجـه ، ( بۆندار) بەرميل ساز
(سـەبۆر) كلێسـا ، ئەنجـوومـەن كـۆرِه ،
(سـێـتكه) رايەڵه ، رەشكەيه ، تۆرِه
خـۆ ( پيـری پيـسكه) نامـەكـاريـيـه
(پيـبـشـيـنيـبـتـڤـه) دەردی هاريـيـه
(گـەلەبۆی نێـبـه) : ئاسـمـانی شـينه
(شـێـرۆكـەی مـۆريێ) : دەريای بەرينه
(پاتەكـه) دۆشـاو ( مـێـوت) هەنگوينه
(سـلادەست) حـەلوا (سـلادكی) شـيـرينه
( گـونچـار) گـۆزەكـەر (بێگون) راكـەره
(پێـچكه) ئاگـردان (پێـچـاڵ) كـەسـەره
(كـەر زينكه) زەنبيل ، (كـارمـان) گـيـرفـانه

(کـــــــــــازە) بــزنــە ( بــەڕان) بــەڕانــە
(شــەکــاڵ) چەقــەڵە ، ( لیـــــا ) ڕێویــیــە
(کـــابـان) بەرازی وەحـــــشـی کـــێـــویـیـــە
(ســمــێخ) پێکەنین ، ( ســمــێــرت) مــردنە
(پیـــتـــیـــو) خـــواردنەوە ( یەدا) خـــواردنە

***

# حكومة صالح جبر

حكامنا ألقــوا بنا في لجــة المصــاعب
وأثقلوا كـــاهل الكادحين بالضـــرائب
حــتى مــتى نُظلمُ لانبــالي بالمصــائب
والشـــعب الان كـــرة بين يدي اللاعب
يأخــذها برغـــبــة الانكليــز للمــلاعب
كــأننا نعــيش في مملكة العــجــائب
إيه صــالح جــبــر إيهِ أنت أب النوائب
أنت أبو الرجــعــيــة الوحــشــيــة المخــالب

نظمت هذه القصيدة في كانون الثاني ١٩٤٨ أثناء الوثبة الوطنية

# حكومة عبدالسلام عارف

أحكام الشعب صادره        وهي الحكومة غادره
لماتزل في غيها        سائرة و سادره
للخير للصلاح لا        تبدر منها بادره
لكنها لسومنا        سوء العذاب قادره
وأيم الحق أنها        فريدة ونادرة
كسيحة عصاؤها        مصنوعة في القاهرة!
مشيرها مهرج        وساقط كالعاهرة
تنقصه ولاجرم        بصيرة وباصرة

رانية: صبيحة ١٩/١٠/١٩٦٤

## غضبة الشعب

غضبة الشعب الأبى أنفجرت
مثل بركان دوياً واندلاعا
وبدت في شكل أدهى ثورة
كشفت عن جبهة الحقِ قناعا
وسرت نيرانها تلتهم
لبنى الظلم قصوراً وقلاعا
يالها من ثورة جامحةٍ
تقلع الطغيان والشر اقتلاعا

نظمت القصيدة بمناسبة ثورة تموز ١٩٥٨ وكانت أطول وتنتهي بالبيت الآتي:

هكذا صرح يُشادللعُلى
بالنضالِ ونظامٍ يتداعى

## الى الزميلة عائدة

زميلتي ست عائدة يا من صدرها مائده
لم أجن منك فائدة!
لاتجنحي للمطلِ نجني من الملل
وانعشيني بالقبل
الشهد في شفتيك والورد في وجنتيك
والنور في ناظريك حياتي بين يديك

* عائدة: حسناء فلسطينية كانت تدرس في معهد العلوم الاجتماعية في صوفيا عام ١٩٨٥.

نهداها بارزتان كمانجه !(*)
وصوتها كأنغام كمانجه

* فاكهة المانجو

## الى المترجمة (مايا)

أملودة رائعة واسمها مايا
تحيطنا بعطفها من كل الزوايا
نظراتها بسماتها من اغلى الهدايا
نرجو لها إلا ترى قطعا الرزايا

صوفيا تموز/ ١٩٨٥

## دوحة الحرية

دوحة الحرية الحمراء نسقيها دماء
نطرد الخصم ونحيا آمنين سعداء!
نحن كرد لا أكراد
نحن شعب لا أفراد

## سهام قصيدتي

قصيدتي فنية فريدة
سهامها ثاقبة سديدة

## الى فاضله

أحن اليك و حق الحياة
حنين الوليد الى الوالدة
ستبقين في خاطري نجمةً
تشع كما الشعلة الخالدة!
وهيهات نسيان افضالك
تعاليت من مرأة رائدة!

صوفيا: ١٩٨٥/٦/٢٦

## جمال بلادي

شمس بلادي سافره	أرض بلادي زاهره
أنسامها، أنفاسُها	عليلة وعاطره
رباعها، رياضها	خضلة و ناضره
تيجان راسياتها	بهية وباهرة
مصائف جبالها	رائعة وساحره
ما أعذب الأسر وما	أجمل هذى الآسرة
يراعتي براعتي	عن وصفها لقاصره
أين لها من رسمها	يد المفن الماهره!

موسكو: ١٩٧١/٥/٢

## أنشودة للعمال

نحن عمال العراق	جند جيش الكادحين
نرفض العيش بذل	تحت نير الظالمين
عزمنا عزم الرجال	عشقنا عشق النضال
في سبيل الانعتاق	نحن عمال العراق
نحن نور للسلام	في دياجير الظلام
نحن روح للحياة	نحن حتف للطغاة
نصرنا آت و باتت	عودة العز أكيدا
وقريبا سوف يغدو	شعبنا حرا سعيدا

دمشق: ١٩٨٤/٦/١

## شباب الصين

شباب الصين لم يرضوا بعيش دونه الاسرى
أذاعوا دعوة الحق جريئا عالياً جهرا
على الطغيان والظلم أثاروا ثورة كبرى
فساروا حيث إجتازوا طريقا شائكا وعرا
أتى عصر المساواة وولت فترة الرق
ظلام الظلم أجتيح بنور العدل والحق
فلول الشر أقتيدت الى السحق الى المحق
شيانكاي شيك لايشفى يقينا من حمى الحمق!
أيا كايشيك يارمز الشرور والضلالات
لحق أنت للصين كقاموس الجنايات
فسحقا ثم سحقاً يا خبيرا بالخيانات،
أترجو النصرَ هلا بعد هذى الاندحارات؟!

سجن الكوت المركزي: نهاية اكتوبر ١٩٤٩

## لسان حبيبتي

لسان حبيبتي روسية وأنا لا أجيد الروسية،
فياليت لسانها كان في فمي!

## طلب وصفه

رفيقتي ست ساهرة أنت طبيبه ماهره
أدعو وأرجو لكما دوما حياة زاهرة
زهرة عمري ذبلت ظروفي جدا قاهره
زوديني بوصفة وقد تكون قادره
أن تضع نهاية سريعة وباتره
لآلامي التي هي على الفؤاد عاصره

دمشق: ١٩٨٦/٨/١٧

## الى الرفيق عزيز محمد بمناسبة منحه و سامين عالميين

يا عزيز دمت للعلياء والعِزّ وساما
انت نجم في سماء المجد يعلو يتسامى

١٩٨٤/٧/١

الا يا ايها الطاغي دع الطغيان و اهجره
فنور الحق قد لاح و عين الشعب تبصره

كويسنجق :١٩٤٦

## بطاقة معايدة

ايتها القريبة البعيدة ارجولك في السنة الجديدة
مواسما و اعيادا سعيدة

١٩٨٦/١٢/٢٨

## الي ماركريت

اين ربة الجمال افروديت
من عروسة الجبال ماركريت؟!

١٩٦٦

## عندما يتيه البطين !

تاه كبير القبقب　　في البراي و السبسب
سريعا مع الربرب　　يجري وراء الهبهب

١٩٨٩

## حول شرح المقولات

بهذه السرعة و السهولة
لايشرح المفهوم و المقولة

١٩٧٧

# کورتەیەک لە بیوگرافیای من

ئەز دلزارم ، ئەحمەدی مستەفای حەویزی لە ئێوارەی هەشتی کانونی دووەمی سالی ١٩٢٠ ، چواردە مانگ دوای کوژانەوەی ئاگری یەکەم شەری گەورەی جیهانی ، لە شاری کۆیە لە دایک بووم و هەر لە سەرەتای ژیانمەوە چاوم بە بینینی گوڵ و درەختی هەمە جۆر پشکوتوەو گوێم بە ئاوازی شیعر ئاو دراوە ، لە باخچەی ماڵەوەمان و لە شیوی رەزاندا کە دوو باخی خۆشمان هەبوو (شەمە ) و (ئۆمەر خۆچان) .

هێشتا منداڵ بوم نەچوبوومە بەر خوێندن کە باوکم بەددنگ داستانە خۆشەکانی (زاڵ و رودابە) و (سیاوەش و سودابە) و (مەنیجە و بیژەن) و (رۆستەم و سوهراب ) ی بۆ دەخوێندینەوە و دەشیکردن بە کوردی . جا ئەم وشە زێرینە سیحراویانە تاویان تێ دەکردم و شاعیرم گەلێ لەلا گەورە بوو هەموو ئاواتم ئەوە بوو کە منیش رۆژێ لە رۆژان ببم بە شاعیر ! دەبێ ئەوەش بڵێم ئەو ژینگەیەی کە منی تێدا ژیاوم ژینگەیێکی شیعری بوو ، باوکم لە ماڵەوە کتێبخانەیەکی هەبوو پر بوو لە کتێبی ئەدەبی و مێژوویی وەک : شانامەی فیردەوسی و دیوانی حافزی شیرازی و بوستان و گوڵستانی سەعدی و مەسنەوی مەعنەوی مەولانا جەلالە دینی رۆمی و پەندی عەتار و دیوانی قائانی کورد نەژاد و نیزامی گەنجەوی دایک کوردو ، کتێبێکی دەسخەتی زۆر جوان و بێ وێنە بەناوی (مەرحەمە) کە لە باردی دیاردە سروشیەکانەوە بوو بە مەزەندەی من یەکێک بوو لە (٥٢) نامەکەی کۆمەڵەی (اخوان الصفا) .

ئەمە جگە لە باغچەیێکی زۆر جوانی ماڵەکەمان کە پری بو لە درەختی نارنج و لیمۆ و پرتەقاڵ و جوانترین جۆرد گوڵی هەمەرەنگ و گولنار و یاسەمین و جۆرەها گیای بۆن خۆش . لە دەرەوەش لە شیوی رەزاندا وەک ئامارەم بۆ کردوە دوو باغی خۆشمان هەبوو شەمەو ئومەر خوچان کە ئەمەی دووەمیان سەیرانگاییێکی زۆر بەناوبانگ بوو .

هەروەها نەنکە (سوراحی ) م ، دایکی باوکم کە خوشکی دایک و باوکی ئەمین ئاغای (ئەختەر ) بووە، شاعیرێکی میللی بووە نۆ برای هەبووە هەر نۆیان کەم و زۆر شیعریان هەبووە ، بە تایبەتی ئەمین ئاغا ، (ئەختەر) شاعیرێکی هەست ناسک و ئاواز دانەر و مەقام زانێکی گەورە بووە ، باوکی هەمووشیان حاجی مەلا بەکر ئاغای حەویزی کە ناوی شیعری (قاصد) بووە، ئەویش شاعیرێکی زۆر بە دەسەڵات بووە و شیعردکانی بە فارسین و ئەم تاکە شیعرە کوردیەش هی ئەوە : (کە ماڵت بوو کە ماڵت بوو)( کە ماڵت چوو کە ماڵت چوو) بەم دواییانە دیوانێکی گەورەی (قاصد) دۆزراوەتەوە و دانەیەکیش لە لای منە نەتەوەکانی بەتەمان چاپی بکەن . حاجی بەکر ئاغادۆستێکی نزیکی میر محەمەد پاشای رەواندز بووە و باوکیشی زۆر دۆستی عەبدولرەحمان پاشای بابان بووە .

کاک مەسعودی مەلای گەورەش دیفەرموو: (هەندی شیعری قاصد لە مستەوای شیعردکانی حافزی شیرازین ). لە بنەماڵەی ئێمەش کەریم شارەزای برام و ئازاد دلزاری کورم و فریشتەی خوشکم شیعریان هەیە و شاعیرن .

جا هەر چەند شاعیریی بە (میرات) بۆ کەس نامێنێتەوە بەڵام ژینگەی ئاوا لەبار و سروشتی جوان مرۆ بەرەو شیعر گوتن دەبا .

## • باری خوێندنم

خوێندنی سوختەخانە و سەرەتایی و ناوەندیم لە کۆیە خوێندووە بەڵام جگە لەوەی لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە تا ئەم ساڵ ٢٠٠٥ کە دەکاتە شەست و نۆ ساڵ خەریکی خوێندنەوە و خۆفێرکردنم لە دەرەوەی وڵاتیش بەشداریم لە چوار خولی رۆشنبیری کردووە کە هەر خولێکی بۆ ماوەی دە مانگ بووە ، دوو خول لە مۆسکۆ و دوو خولیش لە (سۆفیا) ی پایتەختی بولگاریا جگە لە گەلێ کورتە خولی ناو وولات .
یەکەم خولم لە ساڵی ١٩٧٠ لە مۆسکۆ بوو دوا خولیشم لە سۆفیا بوو لە ساڵی ١٩٨٨ کە لە (ئەکادیمیەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان و ئیدارەی دەوڵەت).بووم بڕوانامەی (دپلۆم)م پی بەخشرا لە زانستی مێژوو بزوتنەوەی کرێکاری جیهانی .
جا لەبەر ئەوەی لە (ئینستیتوتی زانستە کۆمەڵایەتیەکان ) ی سەر بە لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤیەتی لە مۆسکۆ ئابووری سیاسی و مێژووی حزبی شیوعی و بزوتنەوەی کرێکاری جیهانی و فەلسەفەمان خوێندبوو لە هەموو دەرسەکان باش بووم و بە تایبەتی لە مادەی تاریخ و بزوتنەوەی کرێکاری جیهانی لە ناو گروپەکەماندا بە یەکەم دەرچوم کە گەڕاینەوە حیزب تەکلیفی لی کردم کە مادەی تاریخ و مێژوو وتنەوەی کرێکاری جیهانی لە خوێندنگەی حزب لە دەرگەڵە بلێمەوە ، بۆیە لە هاوین و پایزی ساڵی ١٩٧٢ و لە هاوینی ١٩٧٣ دا ئەو ئەرکەم بە باشی ئەنجام دا .
خوندکارەکان هەندێکیان کارگێرانی قوتابخانە سەرەتاییەکان بون و هەندێکیان پارێزەر و دوو کەسیان ئەندازیار بوون هەندێکی تریان خوێندکاری زانکۆی بەغدا بوون و دوو خوێندکاری عەرەبستانی سعودیەشمان لەگەڵ بوو لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا .
خوێندکارێک لە بەسرەوە نامەیێکی سوپاسی بۆ ناردبووم لەگەڵ دانەیەک لە بەیتی شیعرە بەناوبانگەکەی مایکۆڤسکی بە ناوی (ڤلادیمێر ئیلیچ لینین) کە کردمە کوردی و لە ساڵی ١٩٧٨ چاپکرا بەڵام زوو حکومەتی بەعس دەستی بەسەر داگرت ، خۆشبەختانە دانەیەکم ئێستاش ماوە .
هەروەها وەک ئاماژەم بۆ کردووە من لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە دەستم کرد بە خوێندنەوە لەپێشان ئەلف لەیلە و لەیلەم خوێندەوە کە زۆری تێنەدەگەیشتم بەڵام خۆشی حیکایەتەکانی رایانکێشام بو خوێندنەوەو فێربوون دوایی (سیف بن ذی یزن) و هەر (١٨) ریوایەتەکانی تاریخی ئیسلامی جۆرجی زێدانم خوێندەوە وەک ( فتاة غسان) و (غادة کربلاء) و (١٧ رەمەزان) و زۆر ریوایەتی دیکەی عەرەبی، تا عەرەبی فێربووم دەستم کرد بە خوێندنەوەی شیعری عەرەبی جاهیلی و سەرەتای ئیسلام و سەردەمی ئومەوی و عەباسی و شیعری ئەندەلوسی و سەردەمی تاریکی و سەردەمی هوشیار بوونەوە خوێندنەوەی شیعری (محمود سامی البارودی) و(اسماعیل صبری) و (حافز ابراهیم) وشەوقی و رصافی و زەهاوی و شاعیرانی هاوچەرخم سەیاب و بلند حەیدەری و عبد

الوهاب البياتي و هەموو ئەو دیوان و کۆمەڵە شیعرە کوردیانەی کە چاپکرابوون دیوانی نالی و سالم و کوردی و حاجی قادری کۆیی و شێخ رەزا و وەفایی و تاهیر بەگ و شیعری ناری و زیوەرو گۆران و هەموو ئەوانەی شیعریان لە گەڵاویژبڵاو دەکردەوە.
هەر وەها سوودی زۆرم لە بەلاغەتی قورئان و لە ئەفسانەکانی پەیمانی کۆن و نوێ (تەورات و ئینجیل) وله (نشید الانشاد) و مزامیری داود وەرگرتوە کتیبەکانی (قصة الادب في العالم و فجر الاسلام وزوحا الاسلام ) ی ئەحمەد ئەمین و (اهل الکهف و عودة الروح) ی توفیق الحکیم و (الایام)ی تەها حوسێن ، (ئیلیادە و ئۆدیسە) ی هۆمیرۆس و چیرۆکە هونەریەکانی گۆگۆڵ و پوشکین و تۆلستۆی و تۆرگنیف و دستۆڤیسکی و چێخەف و گۆرکی و (شولۆخۆف)م خوێندونەتەوە ، تا لە بەهاری ساڵی ١٩٤٠ دا لە تەمەنی بیست ساڵی دەستم بە شیعر دانان کرد ئەم پارچە هونراوەیە تێک هەڵکێشەش سەرەتایی شیعر دانامە:

چەندم گـــۆ خــــوێندن بەســـــه
یـــــا أهـيـــــل المــــدرســــــه

زانـــین هـــیــچ پـــارە نـــاکــــــــا
هــيــــا الـــى المــكـنــســــه

چونــکە کـــوچە مـــــالینتـــــان
أولــــى مــــن الـهـــنـدســـــه

ئیـــش کـــردنتـــان باشـــــتـــــره
مــن تـشـريـح الـســرخـســــه

گـەر مـــــاڵی یەکـــتــــر نەخــــۆن
بــــالـغــــدر و الـغـــطرســـــه

کۆیە : ١٩٤٠

## • من و ڕۆژنامە نووسی:

* لە دوای ئەوە کە لە گەرەکی (ساریکا هییە)ی کەرکوک ماڵەکەمان گیرا لە پێنجی نیسانی ساڵی ١٩٥٥ دا بۆ ماوەی دوو هەفتە چومە ماڵی (روستەم حەویزی ) ی هاوڕێم لە گوندی (نەبی ئاوا) ی ساڵەییان و گەڕامەوە کەرکوک و چومە ماڵی کاکەی فەلاح لە قەڵا بۆ ماوەیێک لەوێ لەگەڵ کاکەدا کە ئەندامی لیژنەی ناوەندی و لێپرسراوی لقی کوردی بوو ڕۆژنامەی ئازادی نەهێنیمان دەردەکرد و جارجارەش پەخشنامەیەک بەپێی

پێـویـست ، دوایی بۆ اشـراف چومـه هەڵەبجـە و لە تەمـوزی ١٩٥٥ دا سـەردانێکی هەورەمانم کرد و چاوم بەم بەهەشتە رەنگینە روون کردەوە جا لە هەل و مەرجێکی تردا لە سەردەمی شۆڕشی ١٤ ی تەموزدا ، بریار درا ببم بە نوسەرێکی هەفتەنامەی ئازادی ئازاد و ئاشکرا

* بۆیە لە ١/ ١٠/ ١٩٦٠ گەیشتـمە بەغـدا چومە نوسـینگەی ئازادی لە شەقامی شێخ عـومـەر و شوێنی نوسـتنیشم لەگەڵ مـامـۆسـتـا گۆران بوو کە لە شەقامی شێخ عـومـر ئاپارتمانێکی زۆر جوانی گرتبوو مـانگی بە حەقدە دینار پێی دەگوت : کۆشکی سپی. نوسەرانی ئازادی عەلەنی بریتی بوون لە هاورێیان مامۆستا گۆران و کاکە حەمەی مەلا کەریم و حەمە کەریم فتح الله و حسێن عارف و منی دڵزار !ماوەی مانگێک بە تەبایی و بە وریایی کارمان دەکرد تا لە ١/١٢/ ١٩٦٠ حەفتەنامەکەمان داخرا کە حەفتەی بوو بوو بە دووجار ، شایانی ئاماژە پێ کردنە کە خاوەن امتیازی حەفـتەنامەکەمان شەهیـدی نەمر هاوڕێ نافع یونس بوو .

* لە سـاڵی ١٩٧٤-١٩٧٩ لە مـاوەی بەرەی بێ بەردا ، حـیـزبی ئێـمـە لە هەمـوو شار و شارۆچکەکانی عـیراق بێرۆی رۆژنامە نووسی کردەوە ئێـمەش لە هەرێمی کوردستـاندا لە هەموو شارەکان نوسینگەمان هەبوو لە هەولێریش نوسێنگەی هەرێمـمان هەبوو کە منیش یەکـێـک بووم لە نووسـەرەکـانی ئەو نووسـینـگەیە ، دەنـگ و باس و راپۆرتمان لە هەمـوو شارەکانی کـوردستـاندا بۆ دەهات و ئێمـەش دەنـگ و باس و نووسـینە بە سودەکانمان رێـک دەخست و لەگەل هەندی نوسینی خۆمـان بۆ رۆژنامـەکـانی (طريق الشـعب) و( ئازادی) و (بیری نوی) و هەندی جاریش بۆ ( الثـقـافة الجـديدة) و (رسـالة العـراق)یشـمـان دەنارد و جارجـارەش سەردانی نوسینـگەکانی سلێـمـانی و کـەرکوکمـان دەکـرد و چەند جـارێکیش سەردانی نووسینگەی دهۆک و مـوسـڵـمان کرد ، ئەمە درێژەی هەبوو تا بەهاری ١٩٧٩ کە بەرەی نا قەومی نا تەقەدومی روخا ئێمەش چوینە پاڵ شۆڕشی کوردستـانەوە .

* لە شاخیش سـاڵـی ١٩٨١ لەگەل ئەدیبانی یەکـێـتی نیشـتـیـمـانی کودستـاندا یەکێتی ئەدیبانی کوردسـتانمان (لەناوزەنگ) پێکهێنا ، ئەوسـا من و کاک رەفیق صابیر نوێنەری حیـزبی شـیـوعی بوین و هەوەڵ ژمـارەی گـۆڤـارەکـەمـان ناوی (پێـروو) بوو واتا (پەروین) (کۆ) بەڵام لە ژمارە دووەوە ناوەکەیان کرد بە (نوسەری کوردستان) .

* سـاڵی ١٩٨٥ دوای گەڕانەوەم لە خولی رۆشنبیری لە سۆفـیـاوە بۆ دیمەشق بریار درا کە منیش بچـمـە پاڵ نووسـەرانی (ئاشـتـی و سـۆسـیـالیـزم) کـە چاپی کـوردی (السـلم و الاشتراكيه) ی ئاشتی خوازانی جیهان بوو کە تا سالی ( ١٩٩٠ ) یش دەردەچوو .

## • ئەندامیەتیم لە یەکێتی و رێکخراوەکاندا

١. لە سـاڵی ١٩٥٩ دا بووم بە ئەندام لە یەکـێـتی ئەدیبـانی عـراقـدا کە سـەرۆکـەکـەمـان محەمەد مەهدی جەواهیری بوو .

تا ئێستاش پێناسەکەمم پاراستووە کە ژمارە (٢٠٠) دوو سەدە و ئیمزای جەواهیری پێوەیە و لە ٣١/تەموزی ١٩٥٩ دەرچووە
٢- لە (١٠/٢/١٩٧٠) وەک ئەندام بووم لە یەکێتی نووسەرانی کورد وەرگیراوم و لە یەکەم کۆنگرەیدا لە رۆژانی ٢٣ - ٢٤ /٦/١٩٧٠ دا بە ئەندامی یەکەم دەستەی بەڕێوەبەری مەڵبەندی گشتی هەڵبژێردرام .
٣- ئەندام بووم لە ئەنجومەنی ئاشتی و هاوکاری عیراق بەسەرۆکایەتی مامۆستا عەزیز شەریف تا لە ساڵی ١٩٧٥ - ١٩٧٩ کە روومان کردە کێوەکانی کوردستان و چوینە پاڵ شۆڕشەوە .
٤- ئەندام بووم لە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی نووسەر و ئەدیبانی کورد لە شاخ لەگەل نووسەر و ئەدیبانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە (ناوزەنگ) لە ساڵی ١٩٨١.
٥- ئەندام بووم لە کۆمەڵەی (نووسەر و رۆژنامە نووس و هونەرمەندە دیموکراتیەکانی عیراق ) لە سوریە لە تەمموزی ١٩٨٧ وە تا رۆیشتنم بۆ سوید لە ئابی ١٩٨٩ دا .
٦- ئەندام بووم لەیەکێتی نووسەرانی کورد لەستوکهۆلم.
٧- ئەندام بووم لە نادی ١٤ تەمووزی عیراقیەکان لە ستۆکهۆڵمی سوید تا گەڕامەوە بۆ کوردستان لە ئابی ١٩٨٤ دا بەیەکجاری . ئەمە جگە لەم چالاکیانەش :
* بەشداریم لە هەردوو کۆنفراسی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە کردوە .
١- لە ١٣-١٥/٩/١٩٥٩
٢- لە ١٥-١٧/٨/١٩٦٠
هەروەها بەشداریم کردوە لە
* میهرەجانی ئەحمەدی خانی لە هاوینی ١٩٩٥دا لە دهۆک
* میهرەجانی مەولەوی لە ٢٥ و ٢٦ و ٢٧ /٥/٢٠٠٠ دا لە سلێمانی
* چوارخولی رۆشنبیری لە دەردوەی وڵات کە تێکرا چل مانگی خایاند

## • بڕوا نامە و رێز لێنان

١- لە ساڵی ١٩٨٨ دا بڕوانامەی (دبلوم) م لە " ئە کادیمیی زانستەکۆمەڵایەتیەکان و ئیدارەی دەوڵەت " دوە لە بولگاریا پێدرا لەزانستیە کۆمەڵایەتیەکان و بەتایبەتی لە مێژوو بزوتنەوەی کرێکارانی جیهاندا
٢- لە کوردستانیش لە ساڵی ١٩٩٦ دەستەی ڤیستڤاڵی گەلاوێژی ئەدەبی رێزی لێنام بە ناردنی تابلۆیەکی هونەری بەناوی (شکۆ نامە) سوپاسیان دەکەم
٣- یەکێتی نووسەرانی کورد - لقی هەولێر تابلۆیەکیان پێ بەخشیم بەناوی رێزلێنان لەگەڵ کاتژمێرێکی دەستی لە ١٠/٢/١٩٩٩دا بەبۆنەی تێپەڕینی ٢٩ ساڵ بەسەر دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد دا .
٤- لە لایەن وەزارەتی رۆشەنبیریەوە کاک فەلەکەدین تابلۆی رێزلێنانی بە ئیمزای خۆی پێشکەش کردم کە ماوەی پەنجاو نۆ ساڵە خەریکی شیعر و نووسینم .. سوپاسی دەکەم .

٥- به بۆنەی ئەمەوە کە بەشداریان بە چەک و خامە لە شۆڕشی کوردستاندا کردووە ، سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەڕێز مام جەلال لە ڕێکەوتی ئاداری ٢٠٠٥ دا بە ئیمزای خۆی خەلاتی پێزانینی کردین کە تابلۆی (پێزانین) و هەزار دۆلار بوو . سوپاسی دەکەم .

٦- زۆر کەسیش لە سەر شیعری منیان نووسیوە وەک مامۆستای شیعرو ئەدەب لە چلەکانی سەدەی رابردوودا پیرەمێردی نەمر کە لە سالی ١٩٤٣دا چەند پارچە شیعرم بۆ ناردئەویش لە یەک لە ژمارەکانی هاوین یان پایزی هەمان ساڵدا پارچە شیعرێکی بلاوکردبۆوەو لە گەڵ تەقدیرکردنی لاوێک کە شیعری (مقبول)دادەنی شیعرەکەش ئاوا دەست پێدەکات: ئەی تازە جەوان گە دەتەوی ژینی بەخۆشی وازبێنە لە سەر خۆشی کەتۆ ژیرو بە هۆشی (بۆ کورد بە پەرۆشی).

* هەروەها زانای نەمر شێخ محەمەدی خاڵ لە ژێر ناوی بابا تاهیری هەمەدانی مەشهوربە(عوریان)لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی پێنجەم سالی(١٩٧٧)لە پەراوێزی لاپەرە (١٠) دا نووسیویەتی "ئەم چوارینانەی بابا تاهیرە لەلایەن شاعیری تازەی بەهرەمەند کاک دلزاری کۆیەوە هەولدراوە کە بکرێت بە کوردی سۆرانی بەلام بە داخەوە هەر حەفتاوحەفت(٧٧)چوارینەی تا ئێستا بۆکراوەو بە تایبەتی لە چاپی داوە و ناوی ناوە گەنجینە ..... ساخوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتی بدات بۆ تەواو کردنی ئەم پرۆژە پیرۆزە"

هەروەها دکتۆر کامیل بەسیر دەڵێ:-

«لەبارەی هونەرییەوە هیچ کەم و کوتییەک لەوەرگێرانەکەی هاوڕێ دڵزارا نابینم، چونکە بەهیچ جۆرێک لای نەداوە لەواتەی چوار خشتەکییەکانی، بەڵکو بەنزیکی هێشتونییەتەوە لەلوڕی. تاقە هیوامان ئەوەیە کە کاک دلزاری کۆڵنەدەر هەموو دیوانەکەی بابا تاهیرمان بۆ وەرگێڕێتە سەر شێوەی سۆرانی».

د. کامیل حەسەن بەسیر

سلێمانی: ١٩٦٠/٧/٩

* کەریم شارەزای ئەدیب و رۆژنامەنووس و رەخنەگریش چاپی یەکەمی ئەم دیوانەمی باش هەڵسەنگاندوەو لە هەموورووێکەوە شی کردۆتەوە و لە ژمارە (١٠)ی سالی(١٩٩٤)دا لە گۆڤارە کارواندا بلاوی کردۆتەوە .

ئەم مامۆستا ئەدیبە بەڕێزانەش :

دکتۆرخەزنەدارو دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول وکاکە حەمەی مەلا کەریم و شێرکۆ بێکەس و حەمە سەعید حەسەن و جەلال دەباغ و کەمال غەمبارو عەبدول رەزاق بیمارو مەجید ئاسنگەرو مەحموود زامدارو ئازاد عەبدولواحید و خەلیل دهۆکی و سەعدوڵلا پەرۆش و ناڵە عەبدولڕەحمان و مەوجود سامان و گەلێ ئەدیب و نووسەری کورد لەبابەت شیعرە کانمیان نووسیوە هەرکەس بەپێی بۆچوونی خۆی. سوپاسی هەموو ئەو خامە بەدەستانە دەکەم.

هەولێر: ٢٠٠٥/١١/٢١ دلزار

# ناوەرۆک

# بڵاوکراوەکانی ساڵی 2006

٢٢٢- کتێبی کوردو کوردستان/ گوتارو باندۆر، نووسینی مینۆرسکی.

٢٢٣- رۆمانی چما/عەگید چەرکز.

٢٢٤- رۆمانی/ هەیئە/ نووسینی سەلام عەبدوڵڵا.

٢٢٥- کتێبی گەردەلولی سیاسەت، چاوپێکەوتن - فؤاد سدیق.

٢٢٦- کتێبی ، ٣ دی ستۆدیۆ ماکس ١ر٣. نووسینی/ شەماڵ ئیسماعیل بەندری.

٢٢٧- العصبيّة القوميّة في منظور الاسلام، عبدالقادر مجيد القشوری. رسالة ماجستير.

٢٢٨- کتێبی برایەتی کوردو کورد، نووسینی/ کەریم رۆژ.

٢٢٩- پەندی پێشینان و بەسەرهاتی کوردی . نووسینی /یاسین حەسەن گۆران.

٢٣٠- کتێبی: زانین رێکا تێ گەشتنا قورئانێ یە، گوتن مەلا حسین یوسف عبدالقادر مارونسی.بەرهەڤکرنا جیهاد ئیسماعیل شێخ عبدالسلام بارزانی.

٢٣١- کتێب : پەیڤکانی نێو هەگبەی رێبوارێک ئاوەدەڵۆک. نووسینی: عەبدوڵڵا شەریف.

٢٣٢- کتێبی ئەکادیمی، قۆناغی پێش رۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١- ١٩٢١) لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی مێژووییە: نووسینی (ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا).

٢٣٣- کتێبی شیعری : دەنگم تۆیەکەی وەستا رەجەبەو هاواری عاشقانی خەرەندە.

٢٣٤- کتێبی راگەیاندن و کاری رۆژنامەگەری. نووسینی/ نوری بێخاڵی.

٢٣٥- پەرتووکا هوزانێ: ئەلند (١٠٠) سروودو هۆزانێن زارۆکان/ نڤیسینا: جگەرسۆز پێندرۆیی.

٢٣٦- کتێبی/ چیرۆکی هەندێ گۆرانی کوردی رەسەن. ئامادەکردنی - باکووری.

٢٣٧- کتێبی - دوو ژیان - نووسەر: عەگید چەرکەس بێکەن - رۆمان.

٢٣٨- کتێبی - لەژێر ساباتی شیعردا - لێتۆژینەوەو بۆچوون و رای هەمەجۆر- نووسینی: موحسین ئاوارە.

٢٣٩- کتێبی:خەزینەکانی هونەر ، نووسەر : پرۆفیسۆر/ د. محمد عارف.

٢٤٠- دیوانی دڵزار - نووسینی ئەحمەد دڵزار.

# پردی ژیان

بەسەر پردی ژیانا دەستە بەدەستە ئینسان،
هەتا هەتایێ دێت و گوزەر دەکا بێ وچان!
پردێکی سەرسوڕمێن و سەیرە لەسەر دوو پایە،
بەندە کە بنکی هەردوو لە ناخی هیچی دایە!
لە بەینی دوو نەبووندا ماوەی ژیان دیارە،
خەبات و خۆشەویستی و ئومێدو ئیش و کارە.

THE COMPLETE POEMS OF

DILZAR

SECON... - 2006

KU... ER